## خشتەی خوێندنەوەی وشەی (أَنَا ) لەکاتی وەستان و گەیاندنن

| پیتی (أَلِف) لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە | پیتی (أَلِف) لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە | نموونە |
|---|---|---|
| وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ | وَمَآ أَنَا۠ | ﴿ أَنَا۠ ﴾ |

**٢- ئەلیفی وشەی ﴿ لَّٰكِنَّا۠ ﴾ تەنها لە (یەك) شوێن هاتووە لەقورئان.**

﴿ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴾ الكهف: ٣٨.

| لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە | لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە |
|---|---|
| لَّٰكِنَّا۠ | لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى |

**٣- ئەلیفی وشەی ﴿ ٱلظُّنُونَا۠ ﴾ تەنها لە (یەك) شوێن هاتووە لەقورئان.**

﴿ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا ﴾

الأحزاب: ١٠ - ١١.

| لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە | لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە |
|---|---|
| ٱلظُّنُونَا۠ | ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبْتُلِىَ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَزُلْزِلُوا۟ زِلْزَالًا شَدِيدًا |

٤- ئەلیفی وشەی ﴿ٱلرَّسُولَا۠﴾ تەنها لە (یەك) شوێن هاتووە لەقورئان.

﴿أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠﴾

الأحزاب: ٦٦ - ٦٧.

لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە

ٱلرَّسُولَا۠

لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە

وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ

أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠

٥- ئەلیفی وشەی ﴿ٱلسَّبِيلَا۠﴾ تەنها لە (یەك) شوێن هاتووە لەقورئان.

﴿وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا﴾ الأحزاب: ٦٧ - ٦٨.

لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە

ٱلسَّبِيلَا۠

لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە

فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ

ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا

٦- ئەلیفی وشەی ﴿قَوَارِيرَاْ﴾ی یەکەم لەسورەتی (الإنسان)، بەڵام لە ﴿قَوَارِيرَاْ﴾ی دووەم لەئایەتی (١٦)ی هەمان سورەت لەسەری بوەستی یان بگەیەنی (أَلِف)ەکە ناخوێندرێتەوە، واتە لەوەستان و گەیاندن تەنها بە (راء) دەخوێندرێتەوە.

## روون کردنەوە/

| نموونە | پیتی (أَلِف) لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە | پیتی(أَلِف) لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە |
|---|---|---|
| ﴿قَوَارِيرَاْ﴾ی یەکەم | ﴿كَانَتْ قَوَارِيرَاْ﴾ | ﴿كَانَتْ قَوَارِيرَاْ ١٥ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ |
| ﴿قَوَارِيرَاْ﴾ی دووەم | لەکاتی وەستان ناخوێندرێتەوە | لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە (أَلِف) |
| | (أَلِف)ی ﴿قَوَارِيرَاْ﴾ | ﴿قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيرًا﴾ |

٧- ئەلیفی وشەی ﴿سَلَٰسِلَاْ﴾ الإنسان: ٤، تەنها لە (یەك) شوێنی قورئان هاتووە، بەدوو جۆر دەخوێندرێتەوە لەکاتی وەستان، بەڵام جگە لەم شوێنە ئەگەر سەیری هەر پیتێك بکەین لەقورئانی مەزن ئەم جۆرە هێمایەی لەسەر بێت (ە) ئەو پیتە ناخوێندرێتەوە.

نموونە: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ البقرة: ٥، ﴿وَمَلَإِيْهِمْ﴾ یونس: ٨٣،

﴿وَثَمُودَاْ﴾ النجم: ٥١، ﴿قَوَارِيرَاْ﴾ الإنسان: ١٦.

## تێبینی لەسەر حەوت ئەلیفەکان لەقورئاندا:

١/ هێمـای (سـکون)ـی لەسـەر (أَلِـف)ـەکان لەشـێوەی (زیـرۆ 0)ـی ئینگلیزیـە تـەنها لەوشـەی ﴿سَلَٰسِلَاْ﴾ نـەبێت لەشـێوەی ژمارە پێنج (٥)ی کوردیە کە تاکە شوێنە لەکاتی وەستان قورئان خوێن بۆی هەیە بەدوو جۆر بیخوێنێتەوە:

- بەبێ (أَلِف) وشەی ﴿سَلَٰسِلَاْ﴾ بخوێندرێت کە ئەم جۆرە لەپێشترە لەجێبەجێکردندا لەکاتی وەستان: (سَلاسِلْ).
- بـە (أَلِـف) وشـەی ﴿سَلَٰسِلَاْ﴾ بخوێنـدرێت لـەکاتی وەسـتان.

٢/ ئەلیفی ﴿وَثَمُودَاْ﴾ لەسورەتەکانی:

- (هود: ٦٨، الفرقان: ٣٨، العنکبوت: ٣٨ و النجم: ٥١)، لـەکاتی وەسـتان و رۆیشـتن لەسـەری ناخوێندرێتـەوە، کـەئاماژەمان بـەجۆری هێماکـە کرد لەخاڵی یەکەم.



# بـەشی دووەم

## ئەم بابەتانە لەخۆدەگرێت:

- پێناسەو جۆرەکانی درێژکردنەوە.

تەوەرەی یەکەم/ درێژکردنەوەی ئاسایی.

تەوەرەی دووەم/ جۆرەکانی درێژکردنەوەی نائاسایی.

تەوەرەی سێیەم/ ریزبەندی بەهێزترینی دوو جۆرەکانی درێژکردنەوە.

# پێناسەی درێژکردنەوە

**پێناسەی (مَـدّ) درێژکردنەوە:**

**لەزمانەوانیـــدا:** زیـادکردن، درێژکردنـەوە، (الزِّيـادَة)[1]، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَيُمۡدِدۡكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ ﴾ نـوح: ١٢، واتــە: پـەروەردگار مـاڵ و سامان و منداڵتان بۆ زیاددەکات.

**لەزاراوەدا:** بریتیـە لەدرێژکردنـەوەی دەنگ بـەپیتێك لەپیتـەکانی (المَـدّ) یان (اللين)[2].

## جۆرەکانی درێژکردنەوە




---

١) الـمَدُّ في اللغةِ: الزِّيادةُ، وإصْطِلاحاً: إطالَةُ الصَّوتِ بِحُرُفِ الـمَد اللين.

٢) پیتەکانی (مَدّ) ئەگەر هۆکاری درێژکردنەوەی هەبوو، واتـە: هـەمزە یان (سـكون)ـی لـەدوا هـاتبوو ئەوە دەبێتە هۆی درێژکردنەوەی دەنگ، بەڵام لەپیتەکانی (اللين) تەنها وەستان بە (سكون) لـەکۆتایی وشە دەبێتە هۆی درێژکردنەوەی دەنگ، نموونە: (قَوْم، خَوْف، قُرَيْش و البَيْت).

## تەوەرەی یەکەم/

## درێژکردنەوەی ئاسایی

### ١- درێژکردنەوەی ئاسایی ( مدُّ الطبيعي ):

بریتیە لەدرێژکردنەوەی پیتەکانی (مَـدّ): بەمەرجێك پیتەکان خۆیان (ساكن) بن وەجوڵەی پێشیان لەرەگەزی خۆیان بێت، وەك: ﴿نُوحِيهَآ﴾ هود: ٤٩، کە هەرسێ جۆری تێدایە لەدرێژکردنەوەی ئاسایی، جا ڕوودانەکەش لەسەر هیچ هۆکارێك نەوەستاوە.

ئەمەش لەکاتی گەیاندن و وەستان هەر بەئەندازەی دوو (حَرَكَة) جووڵە درێژدەکرێتەوە، نموونە: ﴿قَالَ يَـٰمُوسَىٰٓ﴾ الأعراف: ١٤٤.

### پێوەری ماوەی درێژکردنەوەی ئاسایی (المدُّ الطبيعي):

بەئەندازەی دوو جووڵە (حركة) درێژدەکرێتەوە، جا ئەندازەی جووڵە بەقەد گرتنی پەنجەیە یاخود بەقەد کردنەوەی پەنجەیە، ئینجا بەپێی ئەوە ماوەی دوو جووڵە بەقەد گرتنی پەنجەو کردنەوەیەتی.

هەندێ لەزانایانیش ماوەی دوو جووڵەیان بەقەد چرکەیەك دیاری کردووە، هەروەکو هەندێکیشیان ئەندازەی دوو جووڵەیان بەقەد دەربرینی وشەی (بَبَ) یان (تَتَ) داناوە، ئەمەش بەگوێرەی خێرایی یان لەسەر خۆیی خوێنەر دەگۆڕێ، هەرچی هەبێ بابەتەکە بەپێی بیستن و چێژی خوێندنەوەکانە، دیاری کردن و سنوردارکردنی بەپێی زۆر بیستن و جوان وەرگرتنەوە.

**تێبینی/ لەسەر درێژکردنەوەی ئاسایی (مَدُّ الطَبيعي):**

- دروست نیە (المَدّ الطبيعي) لەئەندازەی دوو (حَرَكَة) کەمتر یان زیاتر بێت، زۆربەی خەڵك بەتەواوی مافی (المَدّ الطبيعي) نادات بەتایبەتی لەدەربڕینی (ما النافية) و (واو الجماعة).

نموونە: ﴿ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴾ يوسف: ٧١.

- هەندێك لەخەڵك بەیەك ئاست (المَدّ الطبيعي) ناخوێنێ بەتایبەتی لەسورەتی (الفاتحة).

وەکو: ﴿ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ الفاتحة: ٢، کە (ألِف)ی (عـا) زیاتر لەدوو (حَرَكَة) درێژدەکاتەوە بەهۆی زیادە بایەخدان بەدەنگ و ئاوازی،

وە وشەی ﴿ ٱلصِّرَٰطَ ﴾ الفاتحة: ٦، کە (ألِف)ی (را) بەهەمان شێوە زیاتر لەدوو (حَرَكَة) درێژدەکاتەوە، بۆیە پێویستە وریا بین و بەیەك ئاست بیخوێنین کەدوو (حَرَكَة)یە.



## ٢- درێژکردنەوەی گۆڕاو (مَدُّ البَدَل)[١]:

بریتیە لەدرێژکردنەوەی (ا، و، ی) لەجیاتی (هـمزة)، واتـە: ئـەم وشانەی کـە لەبنچـینەدا لـەدوو (هـمزة) پێکهـاتووە (هـمزة)ـی یەکـەم (حَرَکَـة) جووڵەدارە، وە (همزة)ـی دووەم (ساکن)ـە لەبنچینەدا.

بەم شێوەیە: (أَأْ دَم) لەدەربڕین دەبێتە ﴿ءَادَمَ﴾ البقرة: ٣١.

نموونە: (أُأْ تــواْ) لەدەربڕین دەبێتە ﴿أُوتُواْ﴾ آل عمران: ٢٣.

نموونە: (إِأْ یمان) لەدەربڕین دەبێتە ﴿إِيمَٰنًا﴾ التوبة: ١٢٤.

واتـە: هـەمزەی دووەم گۆڕانکـاری بەسـەردێ جووڵـەو ڕەگـەزی پـێش خۆی وەردەگرێت لـەکاتی وەستان و ڕۆیشتن بەئەندازەی دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە.

تێبینی/ چەند وشەیەك هاتووە لەقورئانی مەزن کەبە (مَدُّ البدَلِ) دەچن بـە (شـبیه بالبـدل) ناسـراون کەپیتـە درێژکردنـەوەکان لەبنەڕەتـدا (همزة)ـی (ساکن) نەبووە.

نموونە: ﴿قُرۡءَانَ﴾ الإسراء: ٧٨، ﴿مَسۡـُٔولٗا﴾ الإسراء: ٣٤، ﴿إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ الصف: ٦.

---

[١] هەنـدێك لـەزانایان (مَـدُّ البَـدَلِ) بـەجۆری (فرعـي) لاوەکـی دادەنـێن، چـونکە لـەپێش پیتـەکانی (مَدّ) هەمزە هاتووە لەبەربوونی هەندێك لەقاریئەکان (القراء) وەك: (وَرْش) کە (مَدُّ البَدَلِ) درێژدەکاتەوە بەئەنـدازەی (٢، ٤، ٦) جووڵـە، بـەڵام هێناومانـە لەگـەڵ مـەددی ئاسـایی بـۆ ئەوەیـە تـا فێرخـواز بەئاسانی بزانێت دوو جووڵە درێژدەکرێتەوە لەریوایەتی (حفص).

## ٣- درێژكردنەوەی لەبڕی، قەرەبوو (مَدُّ العِوَض):

بریتیە لەدرێژكردنەوەی (ألِف) لەكاتی وەستان لەسەر كۆتایی وشە بەمەرجێك پیتی كۆتایی وشەكە تەنوینی (فتحة) هەبێت (منصوب) بێت، واتە: لەبڕی تەنوینی (فتحة) بەئەلیفێك دەخوێندرێتەوە لەكاتی وەستان، بەڵام لەكاتی ڕۆیشتن لەسەر تەنوینەكە ئەوە (مَدّ العِوَض) دروست نابێت، بۆیە ناودەبرێت بە (عِوَض)، چونكە لەبڕی تەنوین (ألِف) دادەنرێت و دەخوێندرێتەوە.

ماوەی درێژكردنەوەی (مَدّ العِوَض) بەئەندازەی دوو جووڵە درێژدەكرێتەوە، دروست نابێت تەنها لەكاتی وەستان نەبێت، وەك ئەم خشتەیەی خوارەوە زیاتر ڕوون كراوەتەوە:

| نموونە | لەكاتی وەستان دەبێت بە(عِوَض) | لەكاتی ڕۆیشتن دەبێت بەتێكهەڵكێشان |
|---|---|---|
| ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ البقرة: ٢ | ﴿هدا﴾ | ﴿هدآ لّلمتقين﴾ |
| ﴿وَنِسَآءً وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ النساء: ١ | ﴿ونساءا﴾ | ﴿ونساءَ وّتقوا الله﴾ |
| ﴿مُّسَمًّى يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ﴾ الرعد: ٢ | ﴿مسمّا﴾ | ﴿مُسَمَّ يُدَبِّرُ الأمر﴾ |
| ﴿وِرْدًا ۝٨٦ لَّا يَمْلِكُونَ﴾ مريم: ٨٦ - ٨٧ | ﴿وِردا﴾ | ﴿وِردَا لّا يملكون﴾ |

## تێبینی لەسەر درێژکردنەوەی لەبڕی (مَدّ عوض):

- زۆرێک لەخەڵک (مَـدّ العـوض) زیـاتر لـەدوو جووڵـە درێژدەکەنـەوە بەتایبـەتی لـەکاتی تـەواوبوونی خوێـندنی قورئـان لـەناو نوێـژدا، بۆ نموونـە کاتـێ لەسـەر ووتـەی خـوای گـەورە ﴿إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًا﴾، ﴿وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًا﴾ دەوەستن.

- کاتێـک (هـاء)ـی مێینـە (تأنیـث) تـەنوینی (فتحـة)ی لەسـەربێت و لەسـەری بوەسـتی ئـەوا (ألِـف) شـوێنی ناگرێتـەوە بـەڵکو بـەپیتی (هاء)ی (ساکن) دەخوێندرێتەوە.

بۆ نموونە:

﴿وَشَجَرَةً﴾ المؤمنون: ٢٠ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿وَشَجَرَهْ﴾.

﴿جَنَّةً﴾ الإنسان: ١٢ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿جَنَّهْ﴾.

﴿رَحْمَةً﴾ الكهف: ٦٥ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿رَحْمَهْ﴾.

﴿نِعْمَةً﴾ القمر: ٣٥ ← لە کاتی وەستان لەسەری ← ﴿نِعْمَهْ﴾.

- هەنـدێک لـەفێرخوازان لـەکاتی دەورکردنـەوەی قورئـانی مـەزن پەلەدەکەن لەدەربڕین لەکاتی وەستان لەسەر (المَدّ العوض).

بۆ نموونە:

﴿رَضِيًّا﴾ مريم: ٦ ← خوێندنەوەی هەڵە ← ﴿رَضِياء﴾.

﴿وَعَشِيًّا﴾ مريم: ١١ ← خوێندنەوەی هەڵە ← ﴿وَعَشِياء﴾.

## ٤- درێژکردنەوەی گەیاندن ( مدُّ الصلة ):

ئەم جۆرە (درێژکردنەوە) دەبێت بە دوو بەش:




### گەیاندنی بچووك:

بریتیە لەهاتنی (هاء)ـی راناو (ضمیر) کە بۆ تاکی نێری نادیار بەکاردێت، جا لەرووی پێوەر (قیاس)ـەوە مەرجە ئەم (هاء)ـە (ضمة) یان (کسرة) بێت، وە بکەوێتە نێوان دوو پیتی جووڵاو، واتە: پیتی پێش و دوای خۆی (سکون) نەبن و (همزة)ـی (قطعِ)ـی بەدوا دانەهاتبێت، بەڵام ئەگەر (همزة القطع)ـی بەدوا داهاتبێت ئەو کات دەبێتە گەیاندنی گەورە (صلة کبری).

### نموونەی گەیاندنی بچووك:

نموونە: ﴿كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ﴾ الإنشقاق: ١٠، لەکاتی گەیاندن دەبێت بە (مَدّ) بەڵام لەکاتی وەستان لەسەر (هاء) بە (سکون) دەخوێندرێتەوە، وەك ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾ فاطر: ٣١، ئەم جۆرە درێژکردنەوە لەریزی درێژکردنەوەی ئاسایی (المدُّ الطبیعي) دادەنرێت، بەڵام گەیاندنی گەورە (مَدّ الصلة الكبرى) ئەم جۆرە درێژدەکەنەوە لەریزی درێژکردنەوەی نائاسایی (المدّ الفرعي) دادەنرێت بەهۆی هەمزەوە گەیاندنی گەورە (مد الصلة الكبرى) درێژدەکرێتەوە کە لەشوێنی خۆیدا باسی دەکەین بەپشتیوانی خوا.

## ئاگاداری:

ئـەم نموونانـەی خـوارەوە لەگـەڵ هاووێنـەکانیان نـابن بـە (مَـدُّ صِـلَة) لەبەرنەبوونی مەرج بۆ درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووک (الصلة الصغرى).

## نموونەکان:

﴿يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ﴾ آل عمران: ٢٩، ﴿مِّنْهُ ٱسْمُهُ﴾ آل عمران: ٤٥.

لەبەر ئەوەی پیتی (هاء) پێش و پاشی (ساکن)ـە

لەبەر ئەوەی پیتی (هاء) پێش و پاشی (ساکن)ـە

﴿فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ آل عمران: ٥٥.

لەبەر ئەوەی پیتی پێش (هاء)، (ساکن)ـە

﴿أَرْجِهْ وَأَخَاهُ﴾ الأعراف: ١١١، الشعراء: ٣٦، ﴿فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ﴾ النمل: ٢٨.

چونکە لە بنەرەتدا (هاء)ی ڕاناو (ضمیر) (ساکن)ـە



**تێبینی/** ئەمانەی خوارەوە لەڕێسای درێژکردنەوەی گەیاندنی بچوك جیادەکرێتەوە واتە (شاذ)ن.

**نموونەی یەکەم/** ﴿وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾ الفرقان: ٦٩.

هەرچەندە مەرجەکانی درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووك (الصلة الصغرى)ی لەسەر جێبەجێ نابێت، چونکە پیتی پێش (هاء) ساکنە، بەڵام هەر دوو جووڵە (حركة) درێژدەکرێتەوە چونکە بەم شێوەیە وەرگیراوە لەپێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەم جۆرە بابەتانەش ریوایەت و بیستن وەردەگیرێت نەك یاسا گشتییەکان، لەریوایەتی (حفص) تەنها لەم شوێنەدا وادەخوێندرێتەوە.

**نموونەی دووەم/** ﴿يَرۡضَهُ لَكُمۡ﴾ الزمر: ٧.

هەرچەندە لەم شوێنە پیتی (هاء) پێش و دوای خۆی جووڵەدارە بەگوێرەی یاساکە بێت دەبێ درێژبکرێتەوە، بەڵام بەبیستن و ریوایەت وەردەگیرێت و درێژناکرێتەوە، لەوێنە (رسم)ی قورئانی مەزن ئەم جۆرە تێبینییە ئاشکرایە لەنوسین نەنوسراوە بە (واو)ی بچووك، چونکە لە بنچینەدا ئەم وشەیە: ﴿يَرۡضَاه﴾ بووە، لەپێش (جزم)ەوە[1] هاتووە.

- پێویستە لەسەر قورئانخوێن پیتی (هاء) لەخوارەوەی (قورگ) دەربهێنێت بەتەواوی (صافي) دوور لەتێکەڵکردن بەمینگە (غنة) بەچاکی دوو لێوەکان بۆ پێشەوە بێنێت لە (هاء)ی (مضموم) بۆ ئەوەی درێژکردنەوەکە دروست بێت.

---

[1] بڕوانە: دلیل الترتیل، لاپەڕە: ١٨٤،

لەگەڵ: علم التجويد (الغوثاني)/ المستوى الثاني، لاپەڕە: ٥٠ – ٥١.

## ٥- درێژکردنەوەی جێگیر (مدُّ التَّمكين)[1]:

بریتیە لەبەیەکگەیشتنی دوو پیتی (یاء) یەکەمیان شەددەدار بێت و دووەمیان (ساكن) بێت.

وەك: ﴿حُيِّيتُم﴾ النساء: ٨٦، ﴿ٱلنَّبِيِّـنَ﴾ مريم: ٥٨، ﴿ٱلۡحَوَارِيِّـنَ﴾ المائدة: ١١١، ﴿عِلِّيِّينَ﴾ المطففين: ١٨، بۆیە ناودەبرێت بەدرێژکردنەوەی جێگیر (مَدُّ التّمكين)، چونکە بەشێوەیەك پیتی (یاء) دەردەچێت کەجێگەی خۆی دەکاتەوە لەشوێنی دەرچوونی بەهۆی شەددەکەیەوە.

- - - - - - - -

## ٦- درێژکردنەوەی ئاسایی لە پیتە پچڕاوەکان (مدُّ الطبيعي في الحروف المقطعة):

بریتیە لەدرێژکردنەوەی پیتەکانی (الطبیعي) کە لەسەرەتای (١٩) سوڕەت لەقورئانی مەزندا هاتووەو پیتەکان بریتین لە پێنج پیت کە لەم وشەیەدا کۆکراونەتەوە (حَيٌّ طَهُرْ) هەریەك لەو پیتانەی بەدوو پیت دەخوێندرێتەوە، پیتی دووەمیان (أَلِف)ـەکە پیتی درێژکردنەوەیە (مَدّ)، وە بەئەندازەی دوو جوولە درێژدەکرێتەوە وەك (المدّ الطَبِيعي). بەم شێوەیە دەردەبڕێت: (حَا، یَا، طَا، هَا، رَا)، واتا (أَلِف)ـەکە لەوەستان و گەیاندن جێگیرەو بە (دووجوولە) دەخوێندرێتەوە.

---

[1]) لە چەند سەرچاوەیەك (مَدّ التمكین) بەشێوازێکی تریش ئاماژەیان پێکردووە: کەپیتی یەکەمیان (واو) یان (یاء)ی درێژکردنەوە بێت، وەپیتی دووەم (واو) یان (یاء)ی لین بێت، کەپێویستە هەردوو پیت ئاشکرا (الاظهار) بکرێت و بەئەندازەی (دوو جوولە) درێژبکرێنەوە.

نموونە: ﴿قَالُواْ وَأَقۡبَلُواْ﴾ یوسف: ٧١، ﴿قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ﴾ یس: ٢٦.

- پیتی (را) لەسەرەتای شەش (٦) سورەت هاتووە کەئەمانەن:

﴿الٓر﴾ يونس: ١، ﴿الٓر﴾ هود: ١، ﴿الٓر﴾ يوسف: ١،

﴿الٓمٓر﴾ الرعد: ١، ﴿الٓر﴾ إبراهيم: ١، ﴿الٓر﴾ الحجر: ١.

- پیتی (ها) لەسەرەتای دوو (٢) سورەت هاتووە کەئەمانەن:

﴿كٓهيعٓصٓ﴾ مريم: ١، ﴿طه﴾ طه: ١.

- پیتی (طا) لەسەرەتای چوار (٤) سورەت هاتووە کەئەمانەن:

﴿طه﴾ طه: ١، ﴿طسٓمٓ﴾ الشعراء: ١،

﴿طسٓ﴾ النمل: ١، ﴿طسٓمٓ﴾ القصص: ١.

- پیتی (يا) لەسەرەتای دوو (٢) سورەت هاتووە کەئەمانەن:

﴿كٓهيعٓصٓ﴾ مريم: ١، ﴿يسٓ﴾ يس: ١.

- پیتی (حا) لە سەرەتای حەوت (٧) سورەت هاتووە کە ئەمانەن :

﴿حمٓ﴾ غافر: ١، ﴿حمٓ﴾ فصلت: ١، ﴿حمٓ﴾ الشورى: ١،

﴿حمٓ﴾ الزخرف: ١، ﴿حمٓ﴾ الدخان: ١، ﴿حمٓ﴾ الجاثية: ١،

﴿حمٓ﴾ الأحقاف: ١.

خوای گەورە لەسەرەتای **بیست و نۆ** (٢٩) سورەت لەقورئانی مەزن بەپیتی پچڕاو دەستی پێکردووە، کە **چواردە** (١٤)[1] پیتی زمانی عەرەبی لەخۆدەگرێت، وە لەکۆی **بیست و نۆ** (٢٩) سورەتەکەش دا **نۆزدە** (١٩)یان بەپیتەکانی (**طبيعي**) دەست پێ کراون.

## تێبینی/

بەیەکگەیشتنی دوو پیتی (**ساکن**) لەنێوان دوو وشە (**التقاء الحرفين الساكنين**):

لەم بابەتە مەبەستمان تەنها پیتی درێژکردنەوەیەکە دەگات بەپیتێکی (**ساکن**) کەبریتیە لەنەخوێندنەوەی پیتی (**مدّ**) لەکاتی گەیاندنی بەوشەی دوای خۆی بەمەرجێك پیتی یەکەمی وشەی دووەم (**ساکن**) بێت.

نموونە: ﴿وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ النمل: ١٥،

﴿فِى ٱلْكَلَٰلَةِ﴾ النساء: ١٧٦،

﴿وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ الزمر: ٧٤.

---

[1]) بە **چواردە** شێوە هاتووە لەقورئانی مەزن کەبریتین لە:

﴿الٓمٓ﴾ البقرة: ١، ﴿الٓمٓصٓ﴾ الأعراف: ١، ﴿الٓر﴾ يونس: ١، ﴿الٓمٓر﴾ الرعد: ١، ﴿طه﴾ طه: ١، ﴿كٓهيعٓصٓ﴾ مريم: ١، ﴿طسٓمٓ﴾ الشعراء: ١، ﴿طسٓ﴾ النمل: ١، ﴿يسٓ﴾ يس: ١، ﴿صٓ﴾ ص: ١، ﴿حمٓ﴾ فصلت: ١، ﴿عٓسٓقٓ﴾ الشورى: ٢، ﴿قٓ﴾ ق: ١، ﴿نٓ﴾ القلم: ١.

## ڕوونکردنەوە:

| پیتی درێژکردنەوە | نموونە | لەکاتی وەستان دەخوێندرێتەوە | لەکاتی گەیاندن ناخوێندرێتەوە |
|---|---|---|---|
| ـَـ ا | ﴿وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ | ﴿وَقَالَا﴾ | ﴿وَقَالَ ٱلْحَمدُ﴾ |
| ـُـ و | ﴿وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ﴾ | ﴿وَقَالُواْ﴾ | ﴿وَقَالُ ٱلْحَمدُ﴾ |
| ـِـ ی | ﴿فِي ٱلْكَلَـٰلَةِ﴾ | ﴿فِي﴾ | ﴿فِلْكَلالة﴾ |

-------------------------



## پوختەو کورتەی بەشەکانی درێژکردنەوەی ئاسایی:

درێژکردنەوەی بنەرەتی بەئەندازەی دووجووڵە درێژ دەکرێتەوە:

درێژکردنەوەی ئاسایی
(المَدُّ الطبيعي)، وەك:
قَال، قِيل، يقُول

درێژکردنەوەی پیتی پچڕوای ئاسایی
(المَدُّ الطبيعى فِي الحرُوف المقطعة)، وەك:
(حي طهر) طه ، كٓهيعٓصٓ، الٓر

درێژکردنەوەی گۆڕاو
(مَدُّ البَدَلْ)، وەك:
ءَادَم، أُوْتُوا، إِيلاف

درێژکردنەوەی جێگیر (مَدُّالتمكين)،
وەك: (حُيِّيتُم)، (ٱلنَّبِيِّـۧنَ)

درێژکردنەوەی لە بری
(مَدُّ العِوَضِ)، وەك:
(ماءً، ماءا)،
(غفوراً، غفورا)

درێژکردنەوەی گەیاندنی بچووك
(مَدُّ الصلة الصغرى)، وەك:
(مَلَكُوتُ بِيَدِهِۦ)، (نَوْمٌ وَلَا سِنَةٌ تَأْخُذُهُۥ لَا)





## تەوەرەی دووەم/

## جۆرەکانی درێژکردنەوەی نائاسایی (مدُّ الفرعي):

| درێژکردنەوە بەهۆی (همزة)وە | درێژکردنەوەی بەهۆی (سکون)ـەوە |
|---|---|
| ١- درێژکردنەوەی بەیەکگەیشتوو (المَدُّ الواجب المُتصِل) | ٤- درێژکردنەوەی پێویست بەهەموو جۆرەکانییەوە (المَدُّ اللازم بِأنواعِهِ) |
| ٢- درێژکردنەوەی گونجاوی جودا (المَدُّ الجائز المُنْفَصِل) | ٥- درێژکردنەوەی تووشهاتوو بە (سکون) (المَدُّ العارض للسكون) |
| ٣- درێژکردنەوەی گەیاندنی گەورە (مَدُّ الصِّلة الكبرى) | ٦- درێژکردنەوەی ناسك، ئاسان، نەرم (مَدّ اللِّين) |

### ١- درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو (المَدُّ الواجِبُ المُتَّصِل):

بریتیە لەدرێژکردنەوەی پیتەکانی (المَدّ) بەمەرجێك لەدوایەوە پیتی (همزة) هاتبێت و لەناو یەك وشەدا بەیەکبگەن، لەم کاتەدا پێویستە (واجبة) دەنگ درێژبکرێتەوە بەئەندازەی (٤ یان ٥) جوولە (حرکة) لەکاتی رۆیشتن بەسەر وشەکە، بەلام (٤) جوولە لەپێشترە لەجێبەجێکردن، هەروەکو شێخ (السمنودي) رەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ: (...خَمْساً وَأَربعاً وَهَذَا أَعدِلُ)، بەلام ئەگەر فێرخواز وەستا لەکۆتایی وشەکە ئەوکات دەبێت بە (عارض للسكون) دروستە فێرخواز ئەوکات بەئەندازەی (٤، ٥ یان ٦) جوولە دەنگ درێژبکاتەوە.

نموونە: ﴿يَشَآءُ﴾ القصص: ٨٢، ﴿سُوٓءُ﴾ محمد: ١٤، ﴿ٱلْمُسِىٓءُ﴾ غافر: ٥٨.

## تێبینی لەسەر درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو (المَدُّ الواجِبُ المُتَصِل):

- بۆیە ناونراوە (واجب) پێویست، چونكە گشت قاریئەكان هاودەنگن لەسەر درێژكردنەوەی لەدوو جوولە (حركة) زیاتر.

- هۆی ناونانی بەیەك گیشتوو (المتصل)، ئەوەیە كەپیتی درێژكردنەوە (المَدّ) لەگەڵ (همزة)دا لەناو یەك وشە بەیەكدەگەن و كۆدەبنەوە.

- پێویستە لەسەر قورئانخوێن وریا بێت لەدەربڕینی (همزة) لەكاتی وەستان لەكۆتایی وشە بەبێ توونەدكردن و هەژان (قلقلة) و ئاسان (تسهیل) كردن.

- ئەگەر هاتوو چەند (مَدّ)ێك لە (متصل و منفصل) كۆبوونەوە لەكاتی خوێندنەوەی قورئانی مەزن، ئەوا پێویستە لەسەر قورئانخوێن یەكسانی بكات لەئەندازەی (مَدّ)ەكان یان (٤ - ٤) یان (٥ - ٥)، نابێت هەندێك شوێن بە (٣) بێت یان بە (٤) یان بە (٥) بێت.

نموونە: ﴿ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾ النساء: ١٤٣،

﴿ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ المائدة: ٤٧.



## ٢- درێژکردنەوەی جودا (الـمَدُّ الجَائِز) یان (الـمَدُّ الـمُنفَصِل):

بریتیە لەوەی کەپیتی درێژکردنەوە (الـمَدّ) لەکۆتایی وشەی یەکەم بێت و پیتی (همزة) لەسەرەتای وشەی دووەم بێت، بەمەرجێك بەیەکبگەن ئینجا دەبێتە درێژکردنەوەی دەنگ بەئەندازەی (٤ یان ٥) جووڵە (حرکة)، بەڵام (٤) جووڵە لەپێشترە لەجێبەجێکردن، هەروەکو شێخ (السمنودي) رەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ: (... خَمْساً وَأَربعاً وَهَذَا أَعدِلُ).

نموونە: ﴿بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾ يوسف: ٣،

﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ النور: ٣١،

﴿فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ الحديد: ٢٢.

**روونکردنەوە:**

| نموونە | لەکاتی وەستان لەسەر پیتی (مَدّ) | جووڵە | بەیەك گەیشتنی هەردوو وشەکە | جووڵە |
|---|---|---|---|---|
| ﴿بِمَآ أَوۡحَيۡنَآ﴾ | ﴿بِمَآ﴾ | (٢) | ﴿بِمَآ ← أَوۡحَيۡنَآ﴾ | (٤ – ٥) |
| ﴿وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ﴾ | ﴿وَتُوبُوٓاْ﴾ | (٢) | ﴿وَتُوبُوٓاْ ← إِلَى ٱللَّهِ﴾ | (٤ – ٥) |
| ﴿فِيٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ | ﴿فِيٓ﴾ | (٢) | ﴿فِيٓ ← أَنفُسِكُمۡ﴾ | (٤ – ٥) |

### تێبینی لەسەر درێژکردنەوەی جودا (الـمَدُّ الجَائِز) یان (الـمَدُّ الـمُنفَصِل):

- هۆی ناونانی بەرێپێدراو (جائز)، چونکە لەچەند ریوایەتێکی تر گونجاوە (رێپێدراوە) بەدوو جووڵە (حرکة) درێژبکرێتەوە، واتە: لەبنەڕەتدا (أصل) بەکورتی (قصر) دەخوێندرێتەوە، وەك لەهەندێ ریوایەتی تر.

- هۆی ناونانی بەلێك جودا (منفصل)، چونکە پیتەکانی (المَدّ) لەوشەیەکەو (همزة)ش لەوشەیەکی ترەو بەجودا هاتووە.

- ئەندازەی درێژکردنەوەی گونجاوی لێکجودا بەئەندازەی (٤ یان ٥) جووڵە (حرکة) درێژدەکرێتەوە لەرێگای (الشاطبية) ئەوەش رێگای زۆربەی هەرە زۆری خەڵکە لەم رۆژگارەدا، بەڵام درێژکردنەوە بەئەندازەی دوو (٢) جووڵە (حرکة) لەرێگای (طيبة النشر)ـە دەبێت فێرخواز لەدەم و زاری مامۆستاکەی وەری بگرێت و شارەزابێت، بۆیە پێویستە لەکاتی خوێندنەوەی لێکجودا (منفصل) بەدوو جوڵە (حرکة) رەچاوی جیاوازی نێوان ڕێگای (الشاطبية) و (الطيبة) بکات.



## درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا لەرووی نووسین دوو بەشە:

١- **الحقيقي:** بریتیە لەوەی کەپیتی درێژکراو جێگیرە لەوێنە (رسم) و دەربڕین (اللفظ).

نموونە: ﴿قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾ التحريم: ٦.

٢- **الحكمي:** بریتیە لەوەی کەپیتی درێژکراو نەنووسراوە لەوێنە (رسم)، بەڵام جێگیرە لەدەربڕین (اللفظ).

نموونە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ التحريم: ٦،

﴿هَٰٓأَنتُمۡ﴾ محمد: ٣٨، ﴿هَٰٓؤُلَآءِ﴾ محمد: ٣٨.

درێژکردنەوەی یەکەم لە﴿هَٰٓؤُلَآءِ﴾ لەگەڵ تێبینی دروست نیە بوەستین لەسەر بەشی یەکەمی نموونەکان وەك وەستان لەسەر (یا) یان (ها) لەبەرئەوەی یەك وشەیە لەوێنەدا (رسماً)، جیاناکرێتەوە پیتی (یا، ها) لەوشەکان.

### تێبینی/

پیتی (هاء) لەووتەی خوای پەروەردگار ﴿هَآؤُمُ﴾ الحاقة: ١٩، لەبنەڕەتی وشەکە دایە، بۆ ئاگادارکردنەوە نیە، ئەو درێژکردنەوەی کەتیایەتی بەیەکگەیشتووە (المد المتصل)ـە درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا (المد المنفصل) نیە.

### ٣- درێژکردنەوەی گەیاندنی گەورە (الـمَدُّ الصلة الكبرى):

ئـەم جـۆرە هـەمان گەیانـدنی (هـاء)ـی بچووکە، بـەڵام بـەهۆکاری (همزة) درێژدەکرێتـەوە کە لـەدوای (هاء)ـەوە هاتووە، کەدەبێتە هۆی درێژکردنـەوەی (واو - یـاء)ـی بچووك لـەکاتی گەیانـدن بـە (همـزة)، ئەندازەی درێژکردنەوەکەی (٤ - ٥) جووڵەیە.

نموونە: ﴿رَبِّهِۦٓ أَحَدًا﴾ الكهف: ١١٠، ﴿مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ﴾ الهُمَزة: ٣.

- - - - - - - - - - - - -

### ٤- درێژکردنەوەی پێویست (الـمَدُّ اللازِمُ):

بریتیـە لـەهاتنی (سـکون)[1]ی بنـەڕەتی (أصـلي) لـەدوای پیتـی درێژکردنـەوەی پێویـسـت (سـکون)ـەکە لـەکاتی وەسـتان و ڕۆیشـتن جیانابێتـەوە، ئەنـدازەی ئـەم جـۆرە درێژکردنەوەیـە شـەش (٦) جووڵـە (حرکة)یە.



[1]) ئەو (سکون)ـەیە کەپێویستەو گۆڕانکاری بەسەرنایەت لەکاتی گەیاندن و وەستان.

## خشتەی بەشەکانی درێژکردنەوەی پێویست (الـمَدُّ اللازِمُ):




---

## بەشەکانی درێژکردنەوەی پێویست (الـمَدُّ اللازِمُ):

### یەکەم/ درێژکردنەوەی پێویستی گرانی وشەیی

### (الـمَدُّ اللازِمُ الـمُثَقل الْكَلِمِي):

بریتییە لەهاتنی پیتی (ساکن)ـی تێکهەڵکێشراو لەدوای پیتی درێژکردنەوە (الـمَدّ).

وەك: ﴿دَآبَّةٍ﴾ الأنعام: ٣٨، ﴿أَتُحَـٰٓجُّوٓنِّي﴾ الأنعام: ٨٠.

- نموونەی پیتی (یاء) نەهاتووە لەقورئانی مەزن.

### تێبینی لەسەر درێژکردنەوەی پێویست (الـمَدُّ اللازِمُ الـمُثَقَّلُ الْكَلِمِي):

زۆرێك لەخەڵك ئەندازەی ئەم درێژکردنەوەی لە (٦) جووڵە (حرکة) زیاتر درێژدەکەنەوەو دەیگەینن بە (٨) جووڵە (حرکة) بەهۆی ئاوازی نەشاز، کە ئەم جۆرە خوێندنەوەیە هەڵەیەو ڕێگەپێنەدراوە، پێویستە فێرخواز ووریا بێت و خۆی لێ بپارێزێت.

- بۆ راهێنان فێرخواز پێویستە دەنگی خۆی تۆمار بکات بەم شێوەیە:
(ءَا، ءُو، ءِي)، هەریەك لەم سێ پیتە دوو جووڵە (حرکة) درێژدەکرێتەوە، واتە ئەندازەکە دەکاتە (٦) جووڵە (حرکة) جا پاشان وشەی ﴿دَآبَّةٍ﴾ یا ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ بخوێنێتەوەو تۆماری بکاتن پاشان گوێبیستی بێت ئەوکاتە بەرچاوروون دەبێت لەپێوەری درێژکردنەوەکەدا.

- پێویستە فێرخواز دەنگی پیتی شەددەدار کە لەدوای پیتی درێژکردنەوە دێت نەشارێتەوە بەجوانی دەری ببڕێت، چونکە لەم کاتەدا پێویستی بەپاڵەپەستۆی دەنگ هەیە لەپیتە شەددەدارەکە.

## روونکردنەوە:

| پیت | نموونە | لە بنەرەتدا پیتی یەکەمی دوای (مَدّ) | پیتی دووەم | نووسین و خوێندنەوە |
|---|---|---|---|---|
| ـَـ ا | ﴿ٱلصَّآخَّةُ﴾ عبس: ٣٣ | خْ | خَ | آ + خْ + خَ = خَّ |
| ـُـ و | ﴿أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي﴾ الأنعام: ٨٠ | نْ | نَ | و~ + نْ + نِ = نِّ |

## دووەم/ درێژکردنەوەی پێویستی بۆ شەددەی وشەیی

(الـمَدُّ اللازِم الـمُخَفف الْكَلِمِي)؛

بریتیە لەهاتنی پیتی (ساكن) لەدوای پیتی درێژکردنەوە (مَدّ).

وەك: ﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ یونس: ٥١،

﴿ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾ یونس: ٩١.

- سێیەمی نیە لەقورئانی مەزن تەنها لەم دوو شوێنە هاتووە.

-----------

## سێیەم/ درێژکردنەوەی پێویستی گرانی پیتی

(الـمَدُّ اللازِم الـمُثَقل الحَرْفِي)؛

بریتیە لەهاتنی یەکێك لەپیتەکانی درێژکردنەوە لەسەرەتای هەندێك لەسورەتەکانی قورئانی مەزن، ئەم جۆرەش تەنها لەپیتی (لام) و (سین) تێکهەڵکێشان دروستدەبێت کەپیتی سێیەم شەددە وەردەگرێت و دەبێت بەدرێژکردنەوەی (اللازِم الـمُثَقل الحَرْفِي).

وەك: ﴿ الٓمٓ ﴾ آل عمران: ٥١، ﴿ طسٓمٓ ﴾ الشعراء: ١.

### ڕوونکردنەوە:

| | | |
|---|---|---|
| ﴿ الٓمٓ ﴾ | تێکهەڵکێش دەکرێ (میم) لەگەڵ (میم) | (أَلِفْ لَآم مِّيمْ) |
| ﴿ طسٓمٓ ﴾ | تێکهەڵکێش دەکرێ (نون) لەگەڵ (میم) | (طَا سِين مِّيمْ) |

## چوارەم/ درێژکردنەوەی پێویستی بێ شەددەی پیتی

## (الـمَدُّ اللازِم الـمُخَفف الحَرْفِي):

بریتیە لەهاتنی یەکێك لەپیتەکانی درێژکردنەوە لەسەرەتای هەندێك لەسورەتەکانی قورئانی مەزن، هەر پیتێك لەپیتەکان بەسێ پیت دەخوێندرێتەوە بێ ئەوەی تێکهەڵکێش بکرێت لەگەڵ دوای خۆی بەپێچەوانەی (المُثقَّل).

وەك: ﴿قٓ﴾ق: ١، جۆری خوێندنەوە: ﴿قآف﴾،

لە ﴿صٓ﴾ ص: ١، جۆری خوێندنەوە: ﴿صآد﴾.

پیتی درێژکردنەوەکە (ألِف)ـە کەوتۆتە ناوەڕاستی سێ پیتەکە بەئەندازەی شەش (٦) جووڵە (حرکة) درێژدەکرێتەوە.

**تێبینی/**

پیتی (عَیْن) لەسەرەتای دوو سورەت هاتووە لەقورئانی مەزن دروستە لەدەربڕین بەئەندازەی (٤ - ٦) جووڵە (حرکة) درێژبکرێتەوە، چونکە پیتی (یـا) لە (عَـیْن) سیفەتی نەرم (اللـین)ـی هەیە، بەڵام (٦) جووڵە (حرکـة) لەپێشترە، وەك ئەم دێرە هۆنراوەیە کە شێخ (الجمزوري) دەفەرمووێ: (وَعَيْنُ ذُو وَجْهَيْنِ والطُولُ أَخَصّ).

کە تەنها لە (دوو) شوێن لەقورئاندا هاتووە:

﴿كٓهيعٓصٓ﴾ مريم: ١، ﴿حمٓ ۝١ عٓسٓقٓ﴾ الشورى: ١-٢.

### ٥- درێژکردنەوەی توشهاتوو بەهۆی (سکون)ـەوە (الـمَدُّ العَارِض لِلسُكُون):

بریتیە لەوەستانی توشهاتوو لەکۆتایی وشە بەمەرجێك پیتی پێش کۆتایی پیتی درێژکردنەوە بێت (ـَ ا ، ـُ و ، ـِ ی).

وەك: ﴿ٱلْعِقَابِ﴾ الأنفال: ١٣، ﴿يَعْلَمُونَ﴾ التوبة: ٦، ﴿ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ الشعراء: ٧٧.

درێژکردنەوە بەهۆی (سکون)ـی نائاسایی دروستە بۆ قورئانخوێن بەئەندازەی (٢ – ٤ – ٦) جووڵە پیتەکانی درێژبکاتەوە.

**تێبینی/**

فێرخوازی بەڕێز ووریابە ئەگەر هاتوو لەدەستپێکی قورئان خوێندن بەیەك لەم جۆرە جووڵانە (٢ – ٤ – ٦) جووڵە دەستت پێکرد ئەوە دەبێت پابەندبیت تا کۆتایی قورئان خوێندنەکە، نابێت بەئارەزووی خۆت لەنێوان (عارض)ـەکان کەم و زیاد بکەی لەیەك کاتدا وەك (ابن الجزري) ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ:

(وَاللَّفْظُ فِي نَظِيْرِهِ كَمِثْلِهِ)

– هۆی ناونانی بە (عارض للسکون) لەبەرئەوەیە پیتی کۆتایی وشەکە لەبنچینەدا (سکون) نیە، بەڵکو بەهۆکاری وەستان لەسەر پیتی کۆتایی وشەکە دەبێت بە (سکون)، بەڵام لەکاتی گەیاندن لەگەڵ وشەی دوای خۆی دەبێت بەدرێژکردنەوەی (المدّ) ئاسایی.

نموونە:

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ← لە کاتی گەیاندن ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ الفاتحة: ٢ - ٣.

### ٦- درێژکردنەوەی نەرم (المَدُّ اللِّين):

بریتیە لەوەستانی (عارض) لەکۆتایی وشە بەمەرجێك پیتی پێش کۆتایی پیتی (اللین) بێت: (ـَـ و ، ـَـ ي) بەهۆی وەستان درێژدەکرێتەوە.

وەك: ﴿نَوۡمٌ﴾، ﴿قُرَيۡشٍ﴾، ﴿وَٱلصَّيۡفِ﴾، ﴿ٱلۡبَيۡتِ﴾ و ﴿خَوۡفٍۭ﴾.

لەکاتی وەستان دروستە بەئەندازەی (٢ - ٤ - ٦) جووڵە درێژبکرێتەوە، بەڵام ئەگەر هات و نەوەستاین لەسەر وشەی ﴿نَوۡمٌ﴾ گەیاندمان بەدوای خۆی لەم کاتە وەك خۆی دەخوێندرێتەوە، بەبێ درێژکردنەوە.

نموونە:

﴿لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ ← لە کاتی گەیاندن ← لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾.



## کۆبوونەوەی پیتەکانی (مَدُّ اللِّين) لەگەڵ (العارض للسكون):

ئەگەر لەخوێندنەوەی قورئانی مەزن درێژکردنەوەی توشهاتوو بەهۆی (سکون)ـەوە (عارض للسکون) لەگەڵ درێژکردنەوەی نەرم (اللِّين) کۆبۆوە، ئەوە پێویستە لەسەر قورئانخوێن ئەندازەی (مَدُّ اللِّين) یەکسان یان کەمتر بکات لە (الـمَدُّ الْعَارِضُ لِلسُّكُونِ)، واتە هیچ کاتێك (مَـدُّ اللِّين) ئەندازەی زیاتر نیە لە (الـمَدُّ الْعَارِضُ لِلسُّكُونِ).

### خشتەیەك بۆ گونجان لەنێوان (مَدُّ اللِّين و الْعَارِضُ لِلسُّكُونِ)

| درێژکردنەوەی تووش هاتوو (سکون) | | درێژکردنەوەی نەرم (اللین) | |
|---|---|---|---|
| (٢) جووڵە | ﴿ٱلْعِقَابِ﴾ | (٢) جووڵە | ﴿نَوْمٌ﴾ |
| (٤) جووڵە | ﴿يَعْلَمُونَ﴾ | (٢ ، ٤) جووڵە | ﴿قُرَيْشٍ﴾ |
| (٦) جووڵە | ﴿ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ | (٢ ، ٤ ، ٦) جووڵە | ﴿ٱلْبَيْتِ﴾ |



## خشتەی ئەندازەی درێژکردنەوەکان بەگشتی



## تەوەرەی سێیەم/




١) بەهێزترینیان (اللازم).

٢) بەیەکگەیشتوو (المتصل).

٣) تووشهاتوو بە (سکون) (العارض للسكون).

٤) ڕێپێدراوی جودا (الجائز المنفصل).

٥) گۆڕاو (البدل).

شێخ (إِبْـرَاهِيم عَلـيّ شَـحَاتَةَ السَّـمَنُّودِيُّ) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت:

أقــوَى الـمَـدُودِ: لازِمٌ فما اتَّـصَلْ
فعــارِضٌ فَـذُو انفِصَالٍ فَبَــــدَلْ
وَسَـبَـبَا مَــــــدٍّ إِذَا مَا وُجِـدَا
فأنَّ أقْوى السَّبَـــبَيْنِ انْفَـــرَدَا

- - - - - - - - - - - - -

## شیکرنەوەی جۆرەکانی بەیەکگەیشتنی دوو هۆکارەکان:

١- کۆبوونــەوەی پێویســت (الــلازم) و گــۆڕاو (البــدل): واتــە ئەگــەر پێویست و گۆڕاو لەسەر پیتێکی درێژکردنەوە کۆبوونەوە، ئەوە کار بە (مَـدّ الــلازم)ــەکە دەکرێــت و (مَــدّ البَــدَلْ) فــەرامۆش دەکــرێ، کــار بەبنچینەی بەهێزترین هۆکارەکانی درێژکردنەوە (الـمَدّ) دەکرێ.

وەك: ﴿ءَآلذَّكَرَيۡنِ﴾ الأنعام: ١٤٣،

﴿ءَآلۡـَٔنَ﴾ یونس: ٥١،

﴿ءَآللَّهُ﴾ النمل: ٥٩.

ئــەم ســێ وشــەیە بــەناوێکی تــریش ناســراون لــەنێو پەرتووکــەکانی (تجویـد) بەدرێژکردنــەوەی لێـك جیاکردنــەوە (الـمَدُّ الفَرق)، واتــە جیا دەکاتەوە لەنێوان هەواڵ و جێگای پرسیار.

٢- کۆبوونەوەی بەیەك گەیشتوو (المتصل) و لـەجیاتی (البـدل): واتـە ئەگەر بەیەکگەیشتوو و گۆڕاو لەسەر پیتێکی درێژکردنەوە کۆبوویـەوە ئەوە کار بە (المتصل) دەکرێ و درێژکردنەوە (بَدّل) فەرامۆش دەکرێ، کار بەبنچینەی بەهێزترینی هۆکارەکانی درێژکردنەوە دەکرێ.

وەك: ﴿رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ البقرة: ٢٦٤.

**٣- کۆبوونەوەی درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا (الجائز المنفصل) لەگەڵ گۆڕاو (البدل):** واتە ئەگەر کۆبۆوە درێژکردنەوەی ڕێپێدراوی جودا لەگەڵ (مَدُّ البَدَل) لەسەر پیتێکی درێژکردنەوە ئەوە کار بەهۆکارە بەهێزەکە دەکرێ، بێهێزەکە فەرامۆش دەکرێ، ئەگەر هەردووکیان یەکسان بوون لەڕووی هێزەوە کار بەهەردووکیان دەکرێت.

وەك: ﴿ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ﴾ یوسف: ١٦.

**٤- کۆبوونەوەی بەیەك گەیشتوو (المتصل) لەگەڵ (العارض للسکون):** واتە ئەگەر درێژکردنەوەی بەیەکگەیشتوو لەگەڵ (سکون) لەسەر پیتی درێژکردنەوە کۆبۆوە، ئەوا کار بەهۆکارە بەهێزەکە دەکرێ بێهێزەکە فەرامۆش دەکرێ، ئەگەر هەردووکیان یەکسان بوون لەڕووی هێزەوە کار بەهەردووکیان دەکرێ.

وەك: ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾ یوسف: ١٦، ﴿ قُرُوٓءٖ ﴾ البقرة: ٢٢٨، ﴿ ٱلۡمُسِيٓءُ ﴾ غافر: ٥٨.



## ڕوونکردنەوە:

قورئانخوێن لەڕێگای ئەم خشتەوە، پێوەری درێژکردنەوەی تووش هاتوو و بەیەك گەیشتووی بۆ دەردەکەوێت:

| وەستان لەسەر (تووش هاتوو) | جووڵە | درێژکردنەوەی بەیەك گەیشتوو لەکاتی ڕۆیشتن | جووڵە | درێژکردنەوەی بە یەك گەیشتوو لە کاتی وەستان | جووڵە |
|---|---|---|---|---|---|
| ﴿ٱلسَّبِيلَ﴾ | ٢ | ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ | ٤ – ٥ | ﴿ٱلنِّسَآءِ﴾ | ٤[1] ٥ ٦ |
| ﴿ٱلسَّبِيلَ﴾ | ٤ | ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ | ٥ | ﴿ٱلنِّسَآءِ﴾ | ٥ ٦ |
| ﴿ٱلسَّبِيلَ﴾ | ٦ | ﴿يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسۡتُنَّ كَأَحَدٖ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ | ٥ | ﴿ٱلنِّسَآءِ﴾ | ٦ |



١) بڕوانە پەرتووکی (السَلْسَبيل الشافي) في تجويد القرآن، نظم وشرح (عثمان بن سليمان مراد)، لاپەڕە/ ٧٥.


بەشەکانی درێژکردنەوە بە گشتی
المد الأصلي يمد بمقدار حركتين ﴿قَالَ يَٰمُوسَىٰ﴾
المد الطبيعي ﴿قَالَ – قِيلَ – يَقُولُ﴾
مد البدل : ﴿ءَادَمَ – أُوتُوا – إِيمَٰنِهِمْ﴾
مد و ، ض : ﴿قَلِيلًا – مُّبِينًا – بِنَآءً﴾
مد الصلة الصغرى : ﴿وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ﴾
مد التمكين : ﴿وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ – ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾
الحروف المقطعة : ( ﴿طه﴾ )
تسقط المد عند التقاء الساكنين
﴿فِى ٱلْكَلَٰلَةِ – وَقَالُوا ٱلْحَمْدُ – ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ﴾
المد الفرعي
المد الفرعي بسبب الهمز
المد الواجب المتصل نحو :
﴿أُولَٰٓئِكَ﴾
﴿قُرُوٓءٍ﴾
﴿سِىٓءَ﴾
المد الجائز المنفصل
نحو: ﴿يَٰٓأَيُّهَا﴾
﴿قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا﴾
﴿يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾
مد الصلة الكبرى نحو:
﴿فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا﴾
﴿هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا﴾
﴿مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ﴾
المد الفرعي بسبب السكون
المد العارض للسكون نحو
﴿حِسَابِ – مُّعْرِضُونَ – قَدِيرٌ﴾
يجوز فيه :
القصر و التوسط و الطول
المد بسبب السكون اللازم
يلحق به
مد اللين نحو : ﴿قُرَيْشٍ – خَوْفٍ﴾
يجوز فيه : القصر والتوسط والطول
المد اللازم الحرفي
المد اللازم الكلمي
المثقل حرفي
نحو :
﴿طسٓمٓ﴾
المخفف
نحو :
﴿قٓ – نٓ﴾
المثقل
نحو :
﴿ٱلْحَآقَّةُ﴾
المخفف
نحو :
﴿ءَآلْـَٰٔنَ﴾
مدّ الفرق : للفرق بين الاستفهام والخبر .. نحو : ﴿قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ﴾
الحروف المقطعة ١٤ ( نص حكيم قطعا له سر )

# بەشی سێیەم

## ئەم بابەتانە لەخۆدەگرێت:

**تەوەرەی یەکەم/** هەمزەی گەیاندن:

**یەکەم:** هەمزەی گەیاندن.

**دووەم:** جووڵەی هەمزە، گەیاندن لەدەستپێکی کار.

**سێیەم:** هەمزەی گەیاندن لەناو.

**چوارەم:** جووڵەی هەمزەی گەیاندن لەدەستپێکی ناو.

**پێنجەم:** هەمزەی گەیاندن لە پیتدا.

**تەوەرەی دووەم/** هەمزەی پچڕاو:

**یەکەم:** شێوەکانی هەمزەی پچڕاو.

**دووەم:** بەراوردێك لەنێوان هەمزەی گەیاندن و پچڕاو.

**سێیەم:** کۆبوونەوەی هەمزەی گەیاندن و پچڕاو.

## تەوەرەی یەکەم

### یەکەم/ هەمزەی گەیاندن ( همزة الوصل ):

لەم باسە بناغەیەکی باو هەیە کەدەگوترێ: (لا تَبْدَأُ العَرَبُ بِسَاكِنٍ، وَلاَ تَقِفُ عَلى مُتَحَرِّكٍ)، واتە: عەرەب لەدەستپێکا بە (ساکن) دەست پێ ناکات، وە لەکاتی وەستانیش بەجووڵە ناوەستێت لەکۆتایی وشە.

لەم بابەتە ئەوە وەردەگیرێت کەسەرەتای هەر وشەیەکی قورئانی مەزن لەدەستپێکا بە (ساکن) نایەت و نابێت، ئەگەر وشەیەك لەسەرەتا (ساکن) بێت ئەوا عەرەب هەمزەی گەیاندن لەسەرەتای وشەکە دادەنێت بۆ رزگارکردنی زمان لەدەربڕینی وشەکە بەقورسی، بۆیە شێخ (خَلِيلْ بنُ أَحَمْد) رەحمەتی خوای لێ بێت ئەم جۆرە گەیاندنە ناودەبات بەپەیژەی رزگاربوونی زمان.

### پێناسەی هەمزەی گەیاندن ( همزة الوصل ):

بریتیە لەو هەمزەیەی کەزمان رزگاردەکات لەدەستپێکا لە (ساکن)وە جێگیردەبێت لەسەرەتای دەربڕینی وشەکە، لەکاتی گەیاندنیش ناخوێندرێتەوەو نامێنێ.

## بەشەكانی ( هەمزەی گەیاندن ) لەدەستپێكدا




هەمزەی گەیاندن دەچێتە سەر كردار (فعل) لەمانەی خوارەوە:

١- كاری رابردوو پێكهاتووە لەپێنج پیت (الفعل الماضی الخماسيُّ)،

وەك: ﴿ٱعۡتَدَىٰ﴾ البقرة: ١٧٨، ﴿ٱقۡتَرَبَتِ﴾ القمر: ١، ﴿ٱشۡتَرَىٰ﴾ التوبة: ١١١.

٢- كاری رابردوو پێكهاتووە لەشەش پیت (الفعل الماضی السُّداسيُّ)،

وەك: ﴿ٱسۡتَسۡقَىٰ﴾ البقرة: ٦٠، ﴿ٱسۡتَكۡبَرَ﴾ ص: ٧٤.

٣- كرداری داخوازی پێكهاتووە لەسێ پیت (الامر مِن الفعل الثلاثيُّ)،

وەك: ﴿ٱضۡرِب﴾ البقرة: ٦، ﴿ٱنظُرۡ﴾ النساء: ٥٠، ﴿ٱدۡعُ﴾ النحل: ١٢٥.

٤- كرداری داخوازی پێكهاتووە لەپێنج پیت (الامر مِن الفعل الخماسيُّ)،

وەك: ﴿ٱنتَهَوۡاْ﴾ البقرة: ١٩٢، ﴿ٱنطَلِقُوٓاْ﴾ المرسلات: ٢٩.

٥- كرداری داخوازی پێكهاتووە لەشەش پیت (الامر مِن الفعل السُّداسيُّ)،

وەك: ﴿ٱسۡتَغۡفِرۡ﴾ التوبة: ٨٠، ﴿ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُ﴾ القصص: ٢٦.

## دووەم/ جووڵەی هەمزەی گەیاندن لەدەستپێکی کار (الفعل):

١- هەمزەی گەیاندن (ضمة) وەردەگرێت لەدەستپێکی کار (فعل) ئەگەر پیتی سێیەمی وشەکە (ضمة) بوو، وە تووش هاتوو (عارض)[1] نەبوو بەڵکو لەبنەڕەتدا هی (فعل)ەکە بووە.

وەك: ﴿ ٱنظُرۡ ﴾النساء: ٥٠، ﴿ ٱرۡكُضۡ ﴾ص: ٤٢،

﴿ ٱدۡعُ ﴾النحل: ١٢٥، ﴿ ٱجۡتُثَّتۡ ﴾ إبراهيم: ٢٦.

٢- هەمزەی گەیاندن (كسرة) وەردەگرێت لەدەستپێکی کار (الفعل) ئەگەر پیتی سێیەم:

- (كسرة) بێت، وەك: ﴿ ٱكۡشِفۡ ﴾ الدخان: ١٢.

- (فتحة) بێت، وەك: ﴿ ٱسۡتَغۡفِرۡ ﴾ آل عمران: ١٥٩،

﴿ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾ البقرة: ٢٧٨.

- (ضمة) یەکی (عارض) بێت، واتا لەبنەڕەتدا هی (فعل)ەکە نەبێت.

وەك: ﴿ ٱمۡشُواْ ﴾[2] ص: ٦، ﴿ ٱبۡنُواْ ﴾الكهف: ٢١، ﴿ ٱئۡتُواْ ﴾ الجاثية: ٢٥،

﴿ ٱقۡضُوٓاْ ﴾ يونس: ٧١، ﴿ وَٱمۡضُواْ ﴾ الحج: ٦٥.

---

[1]) ئەگەر هاتوو (ضمة)ەکە (عارض) بوو، هەمزەی گەیاندن لەدەستپێکردن بە (كسرة) دەخوێندرێتەوە.

[2]) هۆکاری خوێندنەوەی بە (كسرة) لەبنچینەدا پیتی سێیەمی ئەم وشانە (كسرة) بووە، بۆ نموونە: ﴿ ٱمۡشُواْ ﴾ لەبنچینەدا بەم شێوەیە بووە: (امۡشِيُواْ) پاشان گوازراوەتەوە (ضمة)ی یائەکەی -

## سێیەم/ هەمزەی گەیاندن لە ناو (همزة الوصل في الأسماء):

هەمزەی گەیاندن بچێتە سەر ناو دوو جۆرە: (قياسية - سماعية).

- لەرووی پێوەرەوە (قياسي) بريتيە لەمانەی خوارەوە:

١- سەرچاوەی کردار (مصدر الفعل) لە پێنج پيتی (الفعلِ الخُمَاسي).

وەك: ﴿ٱنتِقَامٍ﴾ آل عمران: ٤، ﴿ٱخْتِلَٰفِ﴾ يونس: ٦،

﴿ٱخْتِلَٰفُ﴾ المؤمنون: ٨٠، ﴿ٱبْتِغَآءَ﴾ البقرة: ٢٠٧.

٢- سەرچاوەی کردار (مصدر الفعل) لە شەش پيتی (الفعلُ السُداسِي).

وەك: ﴿ٱسْتِغْفَارُ﴾ التوبة: ١١٤، ﴿ٱسْتِعْجَالَهُم﴾ يونس: ١١،

﴿ٱسْتِكْبَارًا﴾ فاطر: ٤٣، نوح: ٧.

- لەرووی بیستراوەوە (السماعية) لەقورئانی مەزن تەنها لە حەوت وشە هاتووە:

١- (ٱبن) وەك: ﴿إِنَّ ٱبْنِي مِنْ أَهْلِي﴾ هود: ٤٥.

---

- بۆ پيتی (شين) و پاش لابردنی جوولەی پيتی (شين)، لەدوای ئەم دوو پيتە (ساكن)ـەكە بەيەك دەگەن (ياء ، واو) پاشان نامێنێت، پيتی (ياء) لەبەر رزگاربوونی لە بەيەكگەيشتنی دوو پيتی (ساكن).

٢- (ٱبۡنَتَ) جیاوازی نیه **تاك** بێت، وەك: ﴿ وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ﴾ التحريم: ١٢،

یان **دووانه** بێت، وەك: ﴿ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ ﴾ القصص: ٢٧.

٣- ٱمۡرُؤٌاْ )[١] جیاوازی نیه،

(مرفوع) بێت وەك: ﴿ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ ﴾ النساء: ١٧٦،

(منصوب) بێت وەك: ﴿ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمۡرَأَ سَوۡءٍ ﴾ مريم: ٢٨،

(مجرور) بێت وەك: ﴿ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴾ الطور: ٢١.

٤- (ٱثنين) جیاوازی نیه (مرفوع) بێت وەك: ﴿ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ ﴾ المائدة: ١٠،

یان (منصوب) وەك: ﴿ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ ﴾

النحل: ٥١.

٥- (ٱمۡرَأَةٌ) جیاوازی نیه (مفرد) بێت وەك: ﴿ وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ ﴾ النساء: ١٢٨،

یان (مثنی) وەك: ﴿ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ ﴾ القصص: ٢٣.

٦- (ٱسم) وەك: ﴿ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُ ﴾ الصف: ٦.

٧- (ٱثنين) جیاوازی نیه (مرفوع) بێت وەك:

﴿ فَٱنفَجَرَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ ﴾ البقرة: ٦٠،

یان (منصوب) وەك: ﴿ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ﴾ النساء: ١٧٦.

---

[١]) لەم وشەیە پیتی (راء) وەك جوولەی دوای خۆی دەبێت وە لەدەستپێكردنیشی بە (كسرة) دەبێت.

## چوارەم/ جووڵەی هەمزەی گەیاندن لە دەستپێکی ناو ( اسم ):

هەمزەی گەیاندن ( همزة الوصل ) بەردەوام بە (كسرة) دەخوێندرێتەوە لەناوەکان (الأسماء).

**تێبینی:** لەووتەی پیرۆزی خوای گەورە: ﴿ بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ﴾ الحجرات: ١١، دروستە بۆ قورئان خوێن لەدەستپێکردن بەم وشەیە: ﴿ ٱلِٱسْمُ ﴾ بەدوو شێوە بخوێنێتەوە:

١- دەستپێکردن بە (هەمزەی گەیاندن) بە (فتحة)، وەخوێندنەوەی پیتی (لام)ەکەش بە (كسرة)، بەم شێوەیە: ﴿ أَلِسْمُ ﴾.

٢- دەستپێکردن بەپیتی (لام) بە (كسرة) بەبێ (هەمزەی گەیاندن) بەم شێوەیە: ﴿ لِسْمُ ﴾.

---

## پێنجەم/ هەمزەی گەیاندن لە پیتدا ( همزة الوصل في الحرف ):

هەمزەی گەیاندن دەچێتە سەر یەك پیت کەبریتیە لە لامی پێناساندن (لام التعريف) وەبەردەوام بە (فتحة) دەخوێندرێتەوە لەدەستپێکرندا، وەك: ﴿ ٱللَّهُ ﴾ الإخلاص: ١، ﴿ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾ الرحمن: ١، ﴿ ٱلرَّحِيمُ ﴾ الطور: ٢٨.

**تێبینی/** هەمزەی گەیاندن (همزة الوصل) نامێنێ لەنوسین و خوێندنەوە (لفظاً وخطاً) لە (ألـ)ـی پێناساندن ئەگەر لامی (الجرِّ) بچێتە سەر، وەك: ﴿ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ البقرة: ٢.

## تەوەرەی دووەم

### هەمزەی پچڕاو - پچڕێنەر - ( همزة القطع ):

بریتیە لەو هەمزەیەی کە لەدەستپێکی گەیاندن و وەستان دەردەبڕدرێت، وەك: ﴿ أَتَىٰٓ ﴾ النحل: ١،

وە هاوشێوەکانی ﴿ يُؤۡمِنُونَ ﴾ البقرة: ٣،

وە هاوشێوەکانی ﴿ يَشَآءُ ﴾ البقرة: ٩٠.

هاوشێوەکانی هەمزەی پچڕاو لە (ناو، کردار، پیت) دێت، وە بەهەرسێ جۆرە جووڵەکانیەوە لەسەرەتای وشەکان، وە بە (ساکن، متحرك) دێت لەناوەڕاست و کۆتایی وشە.

### یەکەم/ شێوەکانی هەمزەی پچڕاو ( صور همزة القَطع )

١- لەسەرەتای وشە دێت، دەنوسرێت لەسەر (ألِف) بەتەواوی (مطلقاَ) یەکسانە بە (فتحة، ضمة، کسرة).

وەك: ﴿أَبۡصِرۡ ﴾ الكهف: ٢٦، ﴿إِخۡرَاجٖ ﴾ البقرة: ٢٤٠، ﴿أُعِيذُهَا ﴾ آل عمران: ٣٦،

وە بەهەمان شێوە ئەگەر پیتێکی زیاد پێی بگات.

وەك: ﴿ سَأَصۡرِفُ ﴾ الأعراف: ١٤٦.

٢- هەمزەی پچڕاو لەناوەڕاستی وشە دێت یا بە (ساكن) یان بەبزواو (متحرك):

أ/ هەمزەی ساكن: ئەگەر لەپێش بزواو (متحرك) بێت، دەنوسرێت لەسەر پیتەكە لەرەگەزی پێش خۆی وەك ئەمانەی خوارەوە:

- ئەگەر پێشی (فتحة) بێت، دەنوسرێ لەسەر پیتی (ألِف).

وەك: ﴿أَنشَأۡتُمۡ﴾ الواقعة: ٧٢.

- ئەگەر پێشی (كسرة) بێت، دەنوسرێ لەسەر پیتی (یاء).

وەك: ﴿جِئۡتُم﴾ یونس: ٨١، مریم: ٨٩.

- ئەگەر پێشی (ضمة) بێت، دەنوسرێ لەسەر پیتی (واو).

وەك: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾ البقرة: ٢٨٥.

ب/ هەمزەی بزواو (متحرك) لەناوەڕاستی وشە: ئەگەر پێش (همزة)ەكە (ساكن) بێت، دەنوسرێت لەسەر پیتی هەمزە لەرەگەزی جوولەی پێش خۆی بەیەكسان ئەگەر (الساكن صحیحاً) یا پیتەكە (عِلّة) بێت.

وەك: ﴿نِسَآءَكُمۡ﴾ البقرة: ٤٩، ﴿قَآئِمَةٌ﴾ آل عمران: ١١٣، ﴿هَآؤُمُ﴾ الحاقة: ١٩.

ج/ ئەگەر هەمزەكە خۆی (كسرة) بێت، (فتحة، ضمة، كسرة)ی لەپێشی دێت و دەنوسرێت لەسەر پیتی (یاء).

وەك: ﴿يَئِسُواْ﴾ العنكبوت: ٢٣، الممتحنة: ١٣، ﴿سُئِلَتۡ﴾ التكویر: ٨،

﴿بَارِئِكُمۡ﴾ البقرة: ٥٤.

## دووەم/ بەراوردێك لە نێوان هەمزەی گەیاندن و پچڕاو بەچەند خاڵێك:

| هەمزەی گەیاندن ( الوصل ) | هەمزەی پچڕاو ( القطع ) |
| --- | --- |
| ناخوێندرێتەوە لە کاتی گەیاندن | جێگیرە و دەخوێندرێتەوە لە کاتی وەستان و گەیاندن. |
| تەنها لە سەرەتای ووشە دێت. | لە سەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایی ووشە دێت. |
| هیچ کات بە ( ساکن ) نایێت. | بە ( ساکن ) دێت. |
| لە سەر( الف )ەکە وێنەی (صاد) یێکی بچووك کراوە وەرگیراوە لەم ووشەیە بە گەیاندن. | وێنەی هەمزە ( ء ) وەك شێوەی سەری پیتی ( عین ) وایە وە لەسەر پیتی ( الف ، واو ، یاء ) دەنوسرێ و دەخوێندرێتەوە. |
| هیچ کات نایەت لەگەڵ کرداری ڕانەبردوو لە چوار پیتی ( مطلقاً ) بە تەواوی. | لەگەڵ کرداری ڕانەبردوو چوار پیتی دێت. |
| هیچ کات نایەت بە شێوەی پرسیار | هەمزەی پرسیار بریتیە لە پچڕاوی بە ( فتحة ). |



## سێیەم/ کۆبوونەوەی هەمزەی گەیاندن و پچڕاو

## (اجتماع همزتي الوصل والقطع)

پێشـکەوتنی هـەمزەی گەیانـدن لەسـەر هـەمزەی (سـاکن)ـی پچـڕاو، کەتەنها لەکار (فعل) روودەدات،

وەك: ﴿ٱؤۡتُمِنَ﴾ البقرة: ٢٨٣، ﴿ٱئۡتُونِى﴾ یونس: ٧٩،

لەگەڵ شوێنەکانی تریش ﴿ٱئۡتِ﴾ یونس: ١٥، الشعراء: ١٠.

**لەکاتی دەستپێکردن بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:**

لەدەستپێکردنی هەمزەی گەیاندن بەپێی ریزبەندی پیتی سێیەمی کار (فعل) دەبێـت، لەدەسـتپێکردن کـار (فعـل)ـی ﴿ٱؤۡتُمِنَ﴾ بـە (ضـمة) دەسـت پێـدەکرێت، چـونکە پیتـی سـێیەم (ضـمة)یـەکی بنـەڕەتی (أصلي)یە، لە کـار (فعل)ـی ئەم وشـەیەش ﴿ٱئۡتُونِى﴾ لەدەستپێکا بە (کسـرة) دەخوێندرێتـەوە، چونکە پیتـی سـێیەم (ضـمة)کـەی تـووش هـاتووە (عـارض)ـە، لـە کـار (فعـل)ـی وشـەی سـێیەم ﴿ٱئۡتِ﴾ لەدەسـتپێکا بـە (کسـرة) دەخوێندرێتـەوە، چـونکە پیتـی سـێیەم (کسرة)یە.

پاش ئەوەی کارامەو شارەزابووین لەجووڵەی هەمزەی گەیاندن بۆمان دەردەکەوێت یـەکێك لەبنچینەکانی عـەرەب کـەدەگوترێت: دوو هـەمزە لـەنێوان یـەکتر کۆنابنـەوە کـەدووەمیان (سـاکن) بێـت، ئەگـەر دامـەزراو بوو لەسەر شێوەی کار (فعل)، وەك: ﴿ٱؤۡتُمِنَ﴾.

ئەوە ئێمە وەری دەگێرین بۆ واوی بچووك لەسەرەتای كردار (فعل) بەم شێوەیە: (أُوتُمِنَ) لەهەردوو كردار (فعل)ـەكەی تر بە (یاء) دەست پێدەكرێت بەم شێوەیە: ﴿إِيتُونِي﴾، ﴿إِيتِ﴾ .

## پێشكەوتنی هەمزەی پچڕاو بۆ پرسیار لەسەر هەمزەی گەیاندن دوو جۆری هەیە:

١- ئەگەر هەمزەی پچڕاو پێش كەوت لەسەر هەمزەی گەیاندن لە كار (فعل)، ئەوە هەمزەی گەیاندن نانوسرێت و ناخوێندرێتەوە.

وەك لەم خشتەیە دەردەكەوێت:

| نموونە لەبنچینەدا | نووسین و خوێندنەوەی قورئانی مەزن |
|---|---|
| ﴿أَٱتَّخَذْتُمْ﴾ | ﴿أَتَّخَذْتُمْ﴾ البقرة: ٨٠ |
| ﴿أَٱطَّلَعَ﴾ | ﴿أَطَّلَعَ﴾ مريم: ٧٨ |
| ﴿أَٱطْطَفَى﴾ | ﴿أَصْطَفَى﴾ الصافات: ١٥٣ |
| ﴿أَٱفْتَرَى﴾ | ﴿أَفْتَرَىٰ﴾ سبأ: ٨ |
| ﴿أَٱسْتَكْبَرْتَ﴾ | ﴿أَسْتَكْبَرْتَ﴾ ص: ٧٥ |
| ﴿أَٱسْتَغْفَرْتَ﴾ | ﴿أَسْتَغْفَرْتَ﴾ المنافقون: ٦ |
| ﴿أَٱتَّخَذْنَاهُمْ﴾ | ﴿أَتَّخَذْنَٰهُمْ﴾ ص: ٦٣ |

٢- ئەگەر هاتوو هەمزەی پچڕاو پێش هەمزەی گەیاندن کەوت لە (ألْـ)ی ناساندن، ئەوە عەرەب کاردەکات بەپێچەوانەی بناغەی گشتی لەهەمزەی گەیاندن، بەدوو ڕێگا:

أ/ گـۆڕین (الإبـدال): گۆڕینی هەمزەی گەیاندن بەپیتی (الـمدّ) لەم کاتەدا (المَدُّ اللازم) دروست دەبێت بەئەندازەی شەش (٦) جووڵە (حرکة) درێژدەکرێتەوە، ئەمەش لەقورئانی مەزن لەسێ وشەو لە (شەش) شوێندا هاتووە کەبریتین لە:

﴿ءَآلذَّكَرَيۡنِ﴾ الأنعام: ١٤٣، الأنعام: ١٤٤.

﴿ءَآلۡـَٰٔنَ﴾ يونس: ٥١، يونس: ٩١.

﴿ءَآللَّهُ﴾ يونس: ٥٩، النمل: ٥٩.

ب/ ئاسـانکراو (التسـهیل): بریتیە لەدەربڕینی هەمزەی ئاسانکراو لەنێوان هەمزەیەکی ئاشکراو پیتی (المَدّ)ی هاوڕەگەزی لەجووڵە (حرکة)کەی پێش خۆی، بەشێوەیەك هەمزەی ئاسانکراو (التسهیل) دەردەچێت لەنێوان هەمزەو پیتی (ألِف)، وەك جۆری دووەمی خوێندنەوەی ئەم سێ وشەیەی خاڵی یەکەم، بەڵام گۆڕین (الإبدال) لەپێشترە (مقدَّم) لەم سێ وشەیەدا.

تێبینی: تاکە شوێن لەقورئانی مەزن کەدوو پیتی (همزة) بەیەك دەگەن لەریوایەتی (حفص) هەمزەی بەئاسانکراو (التسهیل) دەخوێندرێتەوە، بریتیە لەوشەی: ﴿ءَا۬عۡجَمِيّٞ وَعَرَبِيّٞۗ﴾ لەسورەتی (فصلت: ٤٤).

# بەشی چوارەم

## جۆرەکانی وەستان و دەستپێکردن

### تەوەرەی یەکەم/ وەستان:

**یەکەم:** پێناسەی وەستان.

**دووەم:** جۆرەکانی وەستان.

**سێیەم:** جیاوازی نێوان پچڕان و وەستان و بێدەنگبوون.

**چوارەم:** وەستانی ( السنة ).

### تەوەرەی دووەم/ دەستپێکردن:

**یەکەم:** پێناسەی دەستپێکردن.

**دووەم:** جۆرەکانی دەستپێکردنی ڕێگە پێدراو.

**سێیەم:** جۆرەکانی دەستپێکردنی ناڕێك و ناشایستە.

### تەوەرەی سێیەم/

حوکمی وەستان لەکۆتایی وشە ( سکون، ڕەوم و ئیشمام ).

# تەوەرەی یەکەم

## پێشەکییەك لەسەر وەستان و دەستپێکردن
## (الوقف والابتداء)

بێگومان خودای گەورەو بەتوانا بایەخی داوە بەپاراستنی قورئانی مەزن و چەندین زانای دڵسۆز لەم بوارە شتیان نوسیوەو سازکردوە بۆ ئەوەی پاسەوانی لێ بکەن، کەلەپوری زانستەکانی عوسمانی (الرسم العثماني)[1] و زانستی (نحو) و (صرف) زانستی (الوقف والإبتداء) بونەتە پاسەوانی دەقە قورئانیەکان لەوەی بگۆڕدرێن و واتا پڕ ماناکانیان گۆڕانکارییان بەسەردابێت و رستەو دەستەواژەکانیان لەجێگای خۆی بترازێت، زانایانیش لەهەموو زانستەکان زیاتر بایەخیان بەزانستی (الوقف والإبتداء) داوە، بەشێوەیەك هەندێکیان فێربوونیان بەواجب داناوە، لەبەر ئەو فەرمایشتەی لەپێشەوا عەلی (خودا لێی رازی بێت) گێردراوەتەوە کاتێك کەدەربارەی ئەو ئایەتە پرسیاری لێ کرا: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا﴾ المزمل: ٤، لەوەڵامدا فەرمووی: (الترتيل: تجويد الحروف ومعرفة الوقوف) (ترتيل) بریتیە لەجوان دەربڕینی پیتەکان و شارەزابوون لەشوێنی وەستانەکان.

---

[1]) وێنە (الرسم) ئەو شێوازانەی کەقورئانی پێ نووسراوەتەوە وەك: ﴿ٱلصَّلَوٰةَ﴾ المائدة: ٩، (واو)ـەکە ناخوێندرێتەوە بەڵام لەوێنەو نووسین وەك خۆی دەردەکەوێت، بەم شێوەیەی کەنووسەرانی سروش (الوحي) لەپێغەمبەر (ﷺ) وەریان گرتووەو نووسیویانەتەوە لەکاتی دابەزینی سروش (الوحي).

ئـيبن عومـەریش (خـودای لێ رازی بێـت) دەفـەرمووێ: لەراسـتیدا ماوەیـەکی زۆرمـان بەسـەربرد لـەژیان هەریـەکێ لەئێمـە پـێش قورئـان باوەڕی لەدڵدا جێگیر دەبوو، سوڕەتی قورئـانیش بەسەر پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ) دادەبـەزی ئینجـا ئێمـە لەحـەرام و حەڵاڵەکـەی و فـەرمان و قەدەغەکراوەکانی و ئەو جێگایەی پێویستە لەسەری بوەستین شارەزا دەبووین.[1]

(ابن الجزري) لە (النشر)دا لـەو بارەیـەوە دەڵـێ: لەفەرمایشـتی پێشـەوا عەلی دا (خودا لێی رازی بێت) ئەوە بەبەڵگە وەردەگیرێ، کەشارەزابوون و فێربوونی (وقف) و (ابتـداء) واجبە، ووتـەی ئـیبن عومـەریش (خـودا لێـی رازی بێـت) بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی خۆشارەزاکردنی ئـەو زانسـتە کۆدەنگی هاوەڵانی لەسەرە.

## وەستان (الوقف):

لەفـەرموودەدا هـاتووە: دوو پیـاو هاتنـە لای پێغەمبـەری خـودا (ﷺ) یەکێکیان شایەتی داو گـوتی: (مَن يُطعِ اللهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ رَشَدَ وَمَن يَعْصِهِما، واتا: هەرکەسێ گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرەکەی بکات ئـەوا سـەرفراز بووە، هەرکەسێکیش سەرپێچیان بکات) پاشان وەستا، پێغەمبەر (ﷺ) پێـی فـەرموو: (قُـم بِـئْسَ الْخَطِيـبُ أنـتَ، واتـا: هەسـتە تـۆ خـراپترین ووتاربێـژی) (قـل: وَمَـن يَعْصِـهِما فَقَـدْ غَـوَى، واتـا: بڵـێ: (هەرکەسـێ

---

[1] قال ابن عمر (رضي الله عنه): (لَقَدْ عِشْنَا بُرْهَةً مِنْ دَهْرِنَا وإِنّ أَحدَنَا لَيُؤْتَى الإيمَانَ قَبْلَ القُرآنِ، وَتَنْزِلُ السُّورَةَ على النَّبِيِّ (ﷺ) فَنَتَعَلَّمُ حَلَالَهَا وَحَرَامَهَا، وَأَمْرَهَا وَزَجْرَهَا، وَمَا يَنبَغِي أن يُوقَفَ عِنْدَهُ مِنْهَا) أخرجه الطبراني في الأوسط والحاكم، والبيهقي وقال ورجاله رجال الصحيح.

سەرپێچیشیان بکات سەرلێشێواو بووە)[1]، لەو فەرموودەیە بەڵگەیەکی روون و ئاشکرا هەیە، لەسەر ئەوەی ناپەسندەو ناشرینە هەندێ وشە ببڕی کەپەیوەستە بەو مانایەی لەرستەکەدا هەیە.

هەندێ ریوایەت لەو بارەیەوە هاتووە، (أم سلمة) (خودا لێی رازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خودا (ﷺ) خوێندنی قورئانی دەبڕی و دەیفەرموو: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ پاشان دەوەستا، ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ پاشان دەوەستا، ئەوسا دەیفەرموو: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾.[2]

پێشەوا (الداني)[3] دەڵێ: ئەو فەرمودەیە رێگاکانی زۆرن و بنچینەیە سەبارەت بەو بابەتە.

**یەکەم: پێناسەی وەستان (الوقف):**

**لەزمانەوانیدا:** گرتنەوەو وازهێنان.

پێشەوا (الأشموني) (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: وەستان بریتیە لەدەست هەڵگرتن و وازهێنان لە ووتەو کردار.

---

١) أخرجه أحمد في مسنده ومسلم في صحيحه من حديث عدي بن حاتم.

٢) حديث غريب أخرجه الترمذي وضعفه الألباني.

٣) المكتفى لأبي عمرو الداني ص (١٤٧).

**لەزاراوەدا:** بڕینی دەنگە لەکۆتایی وشەی قورئانیدا بۆ ماوەیەك هەناسەت تێدا هەڵمژی بەپێی باوی ناو خەڵك بەمەبەستی دەستپێکردنەوەی خوێندن نەك بەمەبەستی وازهێنان.

پێویستیشە لەگەڵ ئەو وەستانەدا (بسم الله) بخوێندرێ لەسەرەتای سوڕەتەکاندا، هەروەها ئەو وەستانە لەسەر ئایەتەکاندا هەناسە بخورێتەوە.

**تێبینی:**

**١-** وەستان نابێت لەناوەراستی وشەدا یان لەسەر وشەیەك بێت کە بەوشەیەکی ترەوە نوساوە، وەکو ئەم نموونانەی خوارەوە:

- (مِن) لەفەرمایشتی خوای پەروەردگار:

﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ البقرة: ٣.

- (یاء) لەفەرمایشتی خوای پەروەردگار:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ البقرة: ١٠٤.

- (هاء) لەفەرمایشتی خوای پەروەردگار:

﴿ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ ﴾ الإسراء: ٢٠.

**٢- حوكمی شەرعی لەسەر (وقف) وەستان:** (وقف) دروستە مادام شتێك نەبێت واجبی بكات یان قەدەغەی بكات، (ابن الجزري) بەووتەی خۆی ئامارژەی بۆ ئەوە كردوە:

وَلَيسَ فِي القرآن مِنْ وَقْفٍ وُجَبْ ولا حَرامٌ غيرُ ما لَهُ سَبَبْ

واتا لەقورئاندا هیچ وەستانێكی واجب نیە خوێنەر بەئەنجامنەدانی تاوانبار بێت و، هیچ وەستانێكی (حەرام)یش نیە بەئەنجامدانی گوناهبار بێت، بەڵكو واجب بوونی (وقف) و حەرامبونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شتەی لەدەرەنجامی وەستانەكە روودەدات، وەكو روونكردنەوەی مانای مەبەست، یان گەیاندنی غەیری مانای مەبەست كەئەو مانایە گەرەك نیە، جا ئەگەر وەستانەكە مانای گۆڕی واجبە لەوێ وەستان نەكرێ، ئەگەریش گەیاندن مانای گۆڕی واجبە لەوێ وەستان بكرێ.



## خشتەی جۆرەکانی وەستان (أَنْوَاعُ الوَقف)




(ابن الجزري) (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرموێ:

وَبَعْدَ تَجْوِيْدِكَ لِلْحُرُوفِ        لاَبُدَّ مِنْ مَعْرِفَةِ الْوُقُوفِ

**واتـە:** پاش شارەزابوونت لەسیفەت و ڕەوان دەربڕینی پیتەکان، ئەوا پێویستە لێزان و شارەزابێت لەزانینی وەستان و دەستپێکردن.

## دووەم: جۆرەكانی وەستان (أَنوَاعُ الوَقفِ):

### ١- وەستانی تاقیكردنەوە (الوقف الاختباري):

بریتیە لەوەستان لەسەر وشەیەك كەشوێنی وەستان نیە، بەڵكو بەمەبەستی تاقیكردنەوە یان فێربوون مامۆستا داوا لەقوتابی دەكات لەسەری بوەستێت.

وەك ئەم وشانە: ﴿ لَّٰكِنَّا۠ ﴾ الكهف: ٣٨، ﴿ ءَاتَىٰنِ ۦ ﴾ النمل: ٣٦.

### ٢- وەستانی ناچاری (الوقف الاضطراري):

بریتیە لەوەستان لەسەر وشەیەك بەهۆی هەناسەنەمان یان پشمین یاخود هەرشتێك كە لەدەسەڵاتی قورئانخوێندا نەبێت.

### ٣- وەستانی چاوەڕوانی (الوقف الانتظاري):

بریتیە لەوەستان لەسەر وشەیەك بۆ دیاریكردنی شێوەی یاخود جۆری خوێندنەوەكە.

وەك وەستان لەسەر وشەی: ﴿ وَٱلۡأٓخِرَةِۚ ﴾ النساء: ١٣٤.

### ٤- وەستانی هەڵبژاردەیی (الوقف الاختباري):

بریتیە لەوەستان لەسەر وشەیەكی هەڵبژاردراو، وە ئەم جۆرە پەیوەندی بەیاساكانی (أحكام)ی وەستان هەیە.





## بەشەکانی وەستانی هەڵبژاردەیی

**جۆری یەکەم/** وەستانی تەواو (الوقف التام): بریتیە لەوەستان لەسەر وشەیەك کە ماناکەی تەواوبێت لەرووی (إعراب) و (واتاوە) بەتەواو ناسراوە لەبەرئەوەی رستەکە یاخود وشەکە واتای تەواوەو پێویستی بەوشەی دوای خۆی نیە بۆ تەواوکردنی ماناکەی، یاخود (إعراب)ـەکەی.
وەك وەستان لەسەر ئەم وشانە:

- ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾ الأعراف: ١٨٤.
- ﴿أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُواْ فِىٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّىۗ﴾ الروم: ٨.
- ﴿أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثْنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ﴾ سبأ: ٤٨.

ئەم سێ شوێنە لای پێشەوا (الدّاني) وەستانی تەواو (تام)ـە، هەروەها وەستان لەسەر وشەی: ﴿ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ البقرة: ٥ تەواوە، وە لەچەند بەشێك پێکدێت وەك:

- وەستانی تەواوی رەها (الوقف التام المطلق).
- وەستانی روونی تەواو (وقف البيان التام – اللازم).

- - - - - - - - - - - - - - - -

**ڕوونکردنەوە/** وەستانی تەواو لەم خاڵانەی خوارەوە ڕوون دەبێتەوە:

- لەکۆتایی (إستعاذة) وەستان تەواوە.
- لەکۆتایی (بسملة) وەستان تەواو.
- لەکۆتایی هەموو سورەتێك وەستان تەواوە.
- لەکۆتایی هەموو چیرۆکە قورئانیەکان وەستان تەواوە.
- لەکۆتایی هەموو بڕگەیەکی ڕەحمەت کە لەبڕگەی سزا جیابکاتەوە وەستان تەواوە.

وەك: وەستان لەسەر وشەی ﴿فَضۡلِهِۦۚ﴾ لەئایەتی:

﴿وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ﴾ الشورى: ٢٦.

- لەکۆتایی هەموو ئایەتێك کەئایەتی سزا لەرەحمەت جیابکاتەوە وەستانی تەواوە.

وەك: وەستان لەسەر ﴿أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ﴾ جیاکراو لەئایەتی ڕەحمەت:

﴿وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ البقرة: ٢٥.

  

**١- وەستانی تەواوی - ڕەها (الوقف التام المطلق):**

**- وەستانی پەیوەست بوونی وشەیی (التعلق اللفظي): واتا ئەو وشەیەی لەدواوە دێت پەیوەندی بەوشەکەی پێش خۆی هەبێت لەلایەنی شیکردنەوە (إعراب).**

**- وەستانی پەیوەست بوونی واتایی (هەڵواسراوی واتایی) (التعلق المعنوي): واتا ئەو وشەیەی کە لەدواوە دێت پەیوەندی بەوشەکەی پێش خۆی هەیە لەڕووی واتاوە، واتا پاش وەستان لەسەری و دوای دەستپێکردن بەوشەکەی دوای ئەو، دەتوانی بیگەینی بەوشەی دوای خۆی لەبەرئەوەی بەگەیاندنی دوو وشەکە بەیەکتر واتایەکە ناگۆڕێ.**

**وەك: گەیاندنی وشەی** ﴿نَسْتَعِينُ﴾ **بە** ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾.

**٢- وەستانی ڕوونی تەواو (وقف البيان التام -اللازم-):**

**بریتیە لەوەستان لەسەر وشەیەك، وە دەستپێکردن بەوشەکەی دوای ئەو، چونکە ئەگەر یەکبگرن مانایە تەواوەکە نادات و واتاکەی دەگۆڕێت، وەك وەستان لەسەر ئەم وشانە:**

﴿يَسْمَعُونَ﴾ **لەئایەتی:** ﴿إِنَّمَا يَسْتَجِيبُ الَّذِينَ يَسْمَعُونَ وَالْمَوْتَى يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ ثُمَّ إِلَيْهِ يُرْجَعُونَ﴾

الأنعام: ٣٦،

﴿قَوْلُهُمْ﴾ **لەئایەتی:** ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾ يس:٧٦،

﴿عَنْهُمْ﴾ **لەئایەتی:** ﴿فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَى شَيْءٍ نُكُرٍ﴾ القمر: ٦.

**جۆری دووەم/** **وەستانی لەجێ (الوقف الكافي)**: پچڕاندنی دەنگە لەسەر ڕستەیەك کەواتایەکی دروست ببەخشێت، واتایەکەی پەیوەست بێت بەدوای خۆییەوە نەوەك لەڕووی دەربڕینەوە (لفظ) پێی دەگوترێ وەستانی ئاسایی، لەبەرئەوەی وەستانەکە لەجێگای خۆیەتی و پێویستی بەدواوەی نیە، چونکە لەڕووی دەربڕینەوە پەیوەست نیە بەدواوە وەکو:

- وەستان لەسەر ئەم وشانەی خوارەوە: ﴿أَمۡرِهِۦ﴾ ﴿سَلَفَ﴾ ﴿مِنۡهُ﴾ لەفەرمایشتی خوای گەورە: ﴿أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾ المائدة: ٩٥.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ لەفەرمایشتی خوای پەروەردگار: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ﴾ البقرة: ١٦٨.

وەستان لەم شوێنانە بنچینەیە بە (الوقف الكافي) لەلای پێشەوا (الدّاني)، وەك:

- ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ - ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ البقرة: ٢٠٨.
- ﴿فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ﴾ - ﴿إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾ النساء: ٧٦.
- ﴿كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ﴾ - ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ الأنعام: ١٤٢.

• ﴿قَالَ هَٰذَا مِنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ﴾ - ﴿إِنَّهُۥ عَدُوّٞ مُّضِلّٞ مُّبِينٞ﴾ القصص: ١٥.

• ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ﴾ -
﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ يس: ٦٠.

• ﴿وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُۖ﴾ - ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾ الزخرف: ٦٢.

**جۆری سێیەم/ وەستانی ڕێك (الوقف الحسن): وەستان لەسەر وشەیەك کەتەواوە لەخوودی خۆی، بەڵام پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە لەڕووی دەربڕین و واتاوە وە پێی دەوترێت ڕێك (الحسن)، چونکە بەوەستان لەسەر ئەم شوێنە مانایەکی ڕێك دەبەخشێت، ئەم جۆرە زیاتر لەکۆتایی ئایەت دەبێت، هەروەکو (ابن الجزري) دەفەرموێت:**

(إِلاَّ رُؤُوسَ الآيِ جَوِّزْ فَالْحَسَنْ)

- ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ الفاتحة: ٢-٣.
- ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ٧٥ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾
طه: ٧٥ - ٧٦.
- ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ الماعون: ٤ - ٥.

**وەستان لەسەر وشەی: ﴿لِّلۡمُصَلِّينَ﴾ بەستراوە بەرستەکەی دوای خۆی بەشێوەیەکی زۆر بەهێز لەڕووی ماناو دەربڕینەوە، جا زانایان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی وەستان لەسەری.**

## حوكمی وەستان لەكۆتایی ئایەت

رای زانایان لەسێ بۆچووندا كۆدەكەینەوە:

### بۆچوونی یەكەم:

وەستان لەكۆتایی هەموو ئایەتێك، پاشان دەستپێكردن بەئایەتی دوای خۆی، بێ رەچاوكردنی بوون یان نەبوونی پەیوەندی دوو ئایەتەكە بەیەكترییەوە یاخود بەهەڵەتێگەیشتن لەواتای ئایەت، بەڵگەی ئەمانیش فەرمودەی ئومموسەلەمەی دایكی ئیماندارانە كەدەفەرموێت: كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) سورەتی (الفاتحة)ی دەخوێند، خوێندنەوەكەی دەپچڕاند ئایەت بەئایەت، دەیفەرموو: (الحمدلله رب العالمين) دەوەستا، پاشان دەیفەرموو: (الرحمن الرحيم).

### بۆچوونی دووەم:

حوكمی وەستان لەكۆتایی ئایەتەكان وەك حوكمی وەستانە لەشوێنەكانی تر كەسەرە ئایەت نین، لەرووی وەستانەوە وەستانی تەواو (تام) یان رێك (الحسن).

وەك: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ﴾ الماعون: ٤ - ٥.

واتە: (سزا بۆ نوێژخوێنان، ئەوانەی لەنوێژەكانیان بێئاگان)، لێرەدا گەیاندن (وصل) كردن لەپێشترە لەبەر روونی پەیوەستی نێوان دووئایەتەكە.

**بۆچوونی سێیەم:**

کۆکردنەوەیە لەنێوانی هەردوو ڕێڕەوی پێشوو، بۆیە ئەگەر پەیوەندیان هەبێ بەیەکتر قورئانخوێن دەوەستێ لەکۆتایی ئایەتەکە پاشان دووبارە بەیەکەوە دەیان خوێنیتەوە، وەك:

﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنۡ إِفۡكِهِمۡ لَيَقُولُونَ وەستان پاشان گەیاندن بەیەکتر وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾

الصافات: ١٥١ - ١٥٢.

واتە: (ئەوە نیە ئەوان لەدرۆی خۆیان دەڵێن، خودا کوڕی بووە، وە بەڕاستی ئەوان درۆدەکەن)، وەئەگەر تێکچوونی واتا هەبێت ئەوە حوکمی بەردەوامبوونە.

وەك: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴾ الماعون: ٤ - ٥.

وەخاوەن بۆچوونی **دووەم** و **سێیەم** پشتیان بەوە بەستووە کە لەفەرموودەکەی (**أم سلمة**)دا بەڵگەیەك نیە کەپێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەموو قورئان و بەبەردەوامی وای خوێندبێتەوە[1] ، بەڵکو فەرموودە هەیە کەئەوەی تایبەت بووە بەسوڕەتی (**الفاتحة**)و ئەوەش دەخاتەڕوو کەئەو فەرموودەیە بۆ دروستی راوەستانە لەسەر ئایەتەکان نەك بۆ پێویستی (**الوجوب**).

**تێبینی:** ئەوەی پێی دەوترێت: (**الوقف القبیح**) بۆ کۆتایی هێنانە بەخوێندنەوە، نەك هەناسەدان (**والله أعلم**).

---

١) وادیارە ئەو فەرموودەیە بۆ فاتیحەی ناو نوێژە (**والله أعلم**).

## جۆری چوارەم/ وەستانی نارێك (الوقف القبيح):

وەستان لەسەر وتەیەکە کە تەواونیە لەخودی خۆی و بەستراوە بەرستەی دوای خۆی بەشێوەیەکی زۆر بەهێز لەرووی ماناو دەربڕینەوە، ئەگەر هاتوو لەسەری وەستای مانایەکی جیاواز لەمانا بنەڕەتەکە دەبەخشێت کەرەنگە نارێك بێت و هەر لەبەرئەوەش پێی دەوترێت وەستانی نارێك، چونکە مانایەکەی لەکاتی وەستان لەسەری ناشرین دەبێت، وەك وەستان لەسەر ئەم شوێنانە:

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿لَا يَعْلَمُهَآ﴾ لەئایەتی:

﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ﴾ الأنعام: ٥٩.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿ٱلصَّلَوٰةَ﴾ لەئایەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ﴾ النساء: ٤٣.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿لَا يَغْفِرُ﴾ لەئایەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ﴾ النساء: ٤٨.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿فَأَكَلَهُ﴾ لەئایەتی:

﴿وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ﴾ یوسف: ١٧.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿وَٱلظَّٰلِمِينَ﴾ لەئایەتی:

﴿يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا﴾ الإنسان: ٣١.

پێشەوا (الأشموني) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەفەرموێت: لەسوڕەتی (الفاتحة) سێزدە شوێن ناڕێك و ناشرینە قورئانخوێن تیایدا بوەستێ و دەستپێك بەوشەكەی دوای ئەو بكات: ﴿ٱلْحَمْدُ / رَبِّ / مَٰلِكِ / يَوْمِ / إِيَّاكَ / ٱهْدِنَا / ٱلصِّرَٰطَ / صِرَٰطَ / ٱلَّذِينَ / غَيْرِ / ٱلْمَغْضُوبِ / عَلَيْهِمْ﴾ی دووەم.

- - - - - - - - - - - - - - -

## جۆری پێنجەم/ وەستانی زۆر ناڕێك (أَقبَحُ القَبِيح):

وەستان لەسەر وشەیەكی قورئانی ماناكەی بگۆڕێ كە ماناكە شیاونیە بۆ خوای پەروەردگار، تێگەیشتنەكە پێچەوانەی بیرباوەرە (العقيدة)، وەك (إبن الجزري) دەفەرموێت:

(وَغَيْرُ مَا تَمَّ قَبِيْحٌ وَلَهُ    الْوَقْفُ مُضْطَرًّا وَيُبْدَا قَبْلَه)

وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿لَا يَسْتَحْيِۦ﴾ لەئایەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسْتَحْيِۦٓ أَن يَضْرِبَ مَثَلًا مَّا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا﴾ البقرة: ٢٦.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿وَٱللَّهُ﴾ لەئایەتی:

﴿فَبُهِتَ ٱلَّذِى كَفَرَ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ البقرة: ٢٥٨.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿وَلِلَّهِ﴾ لەئایەتی:

﴿لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾ النحل: ٦٠.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿لَا يَهۡدِي﴾ لەئایەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ﴾ الزمر: ٣.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿إِلَٰهٍ﴾ لەئایەتی:

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٞۖ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ﴾ ص: ٦٥.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿أَرۡسَلۡنَٰكَ﴾ لەئایەتی:

﴿وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَۗ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا﴾ الإسراء: ١٠٥.

- وەستان لەسەر وشەی: ﴿وَٱلۡإِنسَ﴾ لەئایەتی:

﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦.

پێشەوا (الداني) دەفەرموێ: هەر خوێنەرێك هەوای نەفەسی بپچڕێت لەسەر ئەم جۆرە وشانە پێویستە بگەڕێتەوە بۆ ڕستەی پێش خۆی، وتەی پەروەردگار هەندێکی بگەینێ بەهەندێك بەدروستی، خوێنەر ئەگەر وای نەکرد گوناهبار دەبێت، جا ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیەو هەر کەسێك بەمەبەستی ئەنقەست وابکات ئەوە لەئایینی ئیسلام دەردەچێت، خوا پەنامان بدات.



## سێیەم: جیاوازی نێوان پچڕان و وەستان و بێدەنگبوون:

١/ پچڕان (القطع): بریتیە لەپچڕانی دەنگ لەسەر وشەیەکی قورئانی مەزن و وەرگرتنی هەناسە بەنیازی کۆتایی هێنانی خوێندنەوە، جا لەنوێژخوێندن بێت یان لەدەرەوەی نوێژ بێت.

پێویستە فێرخواز لەم شوێنانە خوێندنەوەی قورئان نەپچڕێنێت کە بەشێوەیەکی زۆر بەهێز لەرووی مانا و دەربڕینەوە بەستراوە بەرستەکەی دوای خۆی، واتا پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە.

وەك:

- ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾ چونکە پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە: ﴿فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ البقرة: ٢٢٠.
- ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ﴾ پچڕان لەم شوێنە دەرگای تەوبە دادەخات بەرووی تاوانباران: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ آل عمران: ٨٩.
- ﴿وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ﴾، چونکە پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە: ﴿ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ﴾ طه: ١٢٢.
- ﴿أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ﴾، چونکە پەیوەندی بەدوای خۆی هەیە: ﴿وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ﴾ الصافات: ١٥١ - ١٥٢.

**٢/ وەستان (الوقف):** پچڕانی دەنگە لەسەر کۆتایی وشەیەکی قورئانی مەزن لەگەڵ هەناسە وەرگرتن و پشوودان بەنیازو مەبەستی دەستپێکردنەوەی قورئان خوێندن، بەڵام بەمەرجێك ئەم شوێنەی کەخوێنەر دەستپێدەکات گونجاوو ڕێك بێت لەڕووی واتاوە.

وەك: ﴿وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ﴾ دوای پشوودان لەهەناسە دەستپێك بە: ﴿وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ﴾ الرعد: ١١.

**٣/ بێدەنگبوون (السکت):** بریتیە لەپچڕانی دەنگ لەسەر وشەیەکی قورئانی مەزن بەبێ هەناسەوەرگرتن بۆ ماوەیەکی کەم بەمەبەستی بەردەوامبوون لەخوێندنەوەی قورئانی مەزن، ئەم جۆرە بێدەنگبوونە لەچوار (٤) جێگاو شوێن هاتووە کەپێویستە (واجبة) لەخوێندنەوەی پێشەوا (عاصم)وە لەگێرانەوەی (حفص)و لەڕێگای (الشاطبية)یەوە.

١- بێدەنگبوون لەسەر پیتی (أَلِف) لەوشەی: ﴿عِوَجَاۜ﴾ الکهف: ١، لەکاتی گەیاندنی بە: ﴿قَيِّمٗا﴾ الکهف: ٢.

٢- بێدەنگبوون لەسەر پیتی (أَلِف) لەوشەی: ﴿مَّرۡقَدِنَاۜۗ﴾، لەکاتی گەیاندنی بە: ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾ يس: ٥٢.

٣- بێدەنگبوون لەسەر پیتی (نون) لەوشەی: ﴿وَقِيلَ مَنۡۜ﴾، لەکاتی گەیاندنی بە: ﴿رَاقٖ﴾ القيامة: ٢٧.

٤- بێدەنگبوون لەسەر پیتی (لام) لەوشەی: ﴿كَلَّاۖ بَلۡۜ﴾، لەکاتی گەیاندنی بە: ﴿رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم﴾ المطففين: ١٤.

## روونکردنەوە:

- وەستان لەسەر: ﴿عِوَجَاۜ﴾ لەگەڵ هەناسەوەرگرتن، وەستان لەسەری روونکردنەوەیە کە ﴿قَيِّمًا﴾ پەیوەست نیە بەئایەتی پێش خۆی لەرووی (إعراب)ەوە، بەڵکو (منصوب)ە بە (فعل مُضمَر تقديره) ﴿أَنْزَلَهُ قَيِّمًا﴾.

- وەستان لەسەر: ﴿مَّرْقَدِنَاۜ﴾ تەواو (التام)ە کۆتایی قسەی بێباوەڕانە، دەستپێك بە: ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ﴾ قسەی ئەوان نیە بەڵکو ووتەی فریشتەیە یان باوەڕدارانە.

- بێدەنگبوون لەسەر: ﴿وَقِيلَ مَنْۜ رَاقٍ﴾ لەگەڵ: ﴿كَلَّاۖ بَلْۜ رَانَ﴾ روونکردنەوەیە، تێکهەڵکێشان نابێت، چونکە ماناکە تێك دەدات.



## جگە لەو چوار شوێنەی رابردوو دوو شوێنی تریش هەن لەقورئانی مەزن ڕێگە پێدراوە قورئان خوێن (السكت) بكات:

١- (السكت) لەکۆتایی سورەتی (الأنفال) خوێنەر دەنگ بپچڕێنی بەبێ هەناسەدان بەمەبەستی بەردەوامبوون لەخوێندنەوەی قورئان، بەم شێوازە دەردەبردرێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ﴾، (السكت) لەسەر وشەی ﴿عَلِيمٌۢ﴾ دەبێت پاشان خوێندنی ﴿بَرَآءَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾.

٢- (السكت) لەئایەتی: ﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنِّى مَالِيَهْ ۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّى سُلْطَٰنِيَهْ﴾ الحاقة: ٢٨-٢٩

لەکاتی گەیاندنی: ﴿مَالِيَهْ ۜ ← هَلَكَ﴾.

بەئاشکراکردنی پیتی (هاء) لەکاتی گەیاندنی وشەی ﴿مَالِيَهْ﴾ بە ﴿هَلَكَ﴾ بەم جۆرە دەخوێندرێتەوە: ﴿مَالِيَهْ ۜ﴾ وەستان بەبێ هەناسە ﴿هَلَكَ﴾

خوێنەر بێدەنگ دەبێت لەسەر پیتی (هاء)ی ﴿مَالِيَهْ﴾.

**تێبینی:**

- وریابوون لەڕۆیشتنی هەوای هەناسە لەکاتی بێدەنگبوون (السكت).
- وریابوون لەدروستبوونی پیتی (همزة) لەکاتی بێدەنگبوون (السكت).
- هێماو نیشانەی (السكت) لەقورئانی مەزن لەشێوەی پیتی (س)ینێکی بچووک دانراوە.

- حوكمی شاردنەوە لەسەر: ﴿عِوَجَاۜ﴾ جێبەجێ نابێت پیتی **(جیم)** بەبێ تەنوین نوسراوە.

- حوكمی تێكهەڵكێشان لەسەر پیتی **(راء)** لە: ﴿مَنۡۜ رَاقٍ﴾ و﴿بَلۡۜ رَانَ﴾ جێبەجێ نابێت پیتی **(راء)** بەبێ شەددە نوسراوە.



## چوارەم: وەستانی (السَّنة):

پێی دەوترێت وەستانی (جبريل عليه السلام)، یان وەستانی شوێن کەوتن (الإتباع) واتە لەم شوێنانەی (جبريل عليه السلام) وەستاوە پێغەمبەریش (ﷺ) لەدوای ئەو وەستاوە، هاوەڵانیش بەم شێوەیە وەریانگرتووەو خوێندوویانەتەوە، ئەمەش لە دە (١٠)[1] شوێن هاتووە لەقورئانی مەزن:

- شوێنی یەکەم و دووەم: ﴿فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ﴾ البقرة: ١٤٨، المائدة: ٤٨.
- شوێنی سێیەم: ﴿قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ﴾ آل عمران: ٩٥.
- شوێنی چوارەم: ﴿قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ﴾ المائدة: ١١٦
- شوێنی پێنجەم: ﴿قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾ يوسف: ١٠٨.
- شوێنی شەشەم: ﴿كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾ الرعد: ١٧.
- شوێنی حەوتەم: ﴿وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ﴾ النحل: ٥.
- شوێنی هەشتەم: ﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ﴾ السجدة: ١٨.
- شوێنی نۆیەم: ﴿فَحَشَرَ﴾ النازعات: ٢٣.
- شوێنی دەیەم: ﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ﴾ القدر: ٣.

---

١) ئەم دە (١٠) شوێنەیە شێخ (أحمد بن عبدالكريم الأشموني) باسی کردووە لەپەرتووکی (منار الهدى في بيان الوقف والابتداء) گواستیتییەوە لەشێخ (السّخاوي).

وەهەنـدێك لەپەرتووكـەكانی زانسـتی (تەجویـد) حـەوت (٧) شـوێنی تریان زیاد كردووە كەئەمانەن:

- شوێنی یەكەم: ﴿أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ﴾ یونس: ٢.
- شوێنی دووەم: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾ یونس: ٦٥.
- شوێنی سێیەم: ﴿إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ﴾ النحل: ١٠٣.
- شوێنی چوارەم: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ لقمان: ١٣.
- شوێنی پێنجەم: ﴿أَنَّهُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ غافر: ٦.
- شوێنی شەشەم: ﴿مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾ القدر: ٤.
- شوێنی حەوتەم: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ﴾ النصر: ٣.

بەڵام هەندێك لەزانایان رایان وایە ئەم (١٧) وەستانە بەڵگەی لەسـەر نیە وەكـو شـێخ (محمـود الخليـل الحصـري) (رەحمـەتی خـوای لێ بێـت) دەفـەرموێ: وەسـتان لـەم حەڤـدە (١٧) شـوێنانە پێـی دەڵـێن وەسـتانی (السـنة)، وە وەسـتانی (جبريـل عليـه السلام)، وە وەسـتانی شـوێنكەوتن (الإتباع)، لەبەرئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لـەم شـوێنانە ئەوەستا بەبەردەوامی وایـان ووتـووە، بـەڵام لەگـەڵ بەدواداچـوون بەچڕی و گـەڕان لەهـەموو لایەكـەوەو بـەجیاوازی سەرچاوەی كتێبـەكان لەزانسـتی قورئـان و راڤـەو سوننەوەو لەهەموو ئەسەرەكانیش، هیچ شوێن پێیـەكی راست یان لاواز نـابینرێ ئـامـاژە بـەم جـۆرە وەسـتانە بكـات لەهـەموو ئـەو شـوێنانە یـان لەهەنـدێك سـووننەتە كرداریـیـەكان و ووتەییـەكان، لەوانەیـە پـاش ئەمـە تۆزێك لەدڵەڕاوكێیەكە كەم بكات و ویژدان ئاسوودە بكات.

## جۆرەکانی دەستپێکردن ( الابتداء ) لەخوێندنەوەی قورئانی مەزن

هەڵبژاردەیی ﴿اختیاريّ﴾

بۆ تاقیکردنەوە ﴿اختباريّ﴾

دەستپێکردنی راستەقینە (ابتداء حقیقي): بریتییە لەدەستپێکردنێکی سەربەخۆ لەسەرەتای خوێندنەوەی قورئانی مەزن لەڕووی واتاوە پەیوەندی نەبێت بە پێشەخۆی، جا لەناو نوێژبێت یان لەدەرەوەی نوێژ.

دەستپێکردنی زیادە (ابتداء إضافي): بریتییە لەدەستپێکردنەوەی خوێندن لەهەمان کات پاش وەستان، ئەوەش تەنها بەویستی خوێنەر دەبێت بەمەرجێك دەستپێکردنەکە مانای جوان ببەخشێت و رێگەپێدراوبێت.

- رێپێدراوی تەواو جائز ( تامٌ ) ← تەواو( تامٌ )
- رێپێنەدراو ( غیرُ جائز ) ← لەجێ ( کافٍ )
- رێپێدراو (جائز ) ← رێك (حَسَنٌ )
- رێپێنەدراو ( غیرُ جائز ) ← نابەجێ ( قبیحٌ ) / دەستپێکردنی نارەوا (الإبتداء التعسفي)





## تەوەرەی دووەم

### دەستپێکردن (الإبتداء)

**یەکەم/ پێناسەی دەستپێکردن:**

**لە زمانەوانیدا:** سەرەتای دەستپێکردن بەشتێك، واتە دەستپێکردن و دەستبەکاربوون.

**لە زاراوەدا:** چوونە ناو قورئان خوێندنەوە پاش پچڕان یان وەستان، ئەوەش تەنها بەویستی خوێنەر دەبێت بەمەرجێك دەستپێکردنەکە مانای جوان ببەخشێت و پەیوەندی نەبێت بەئایەتی پێش خۆی.

**دووەم/ جۆرەکانی دەستپێکردنی ڕێگە پێدراو:**

دەستپێکردنی ڕێگەپێدراو: واتە دەستکردن بەقسەیەکی سەربەخۆ کەویستی خوای گەورە (الله) تیایدا روون دەبێتەوە.

**١- دەستپێکردنی تەواو (الابتداء التام):**

واتە پەیوەست نەبێت بەو رستەی پێش خۆی نە لەرووی خوێندنەوە، نە لەرووی مانا.

وەکو: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾

البقرة: ٦.

## ڕوونکردنەوە:

- دەستپێکردن بە: ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ تەواوە.
- دەستپێکردن بە: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ الفاتحة: ١، تەواوە.
- دەستپێکردن لەسەرەتای هەموو سوڕەتێك تەواوە.
- دەستپێکردن لەسەرەتای هەموو چیرۆکە قورئانیەکان تەواوە.

## ٢- دەستپێکردنی لەجێ (الابتداء الكافي):

واتە پەیوەستە بەرستەی پێش خۆی تەنها لەرووی ماناوە، ئەم جۆرە دەستپێکردنە بەدوای وەستانی لەجێ (**الوقف الكافي**)دا دێت.

وەکو: ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴾ البقرة: ٧.

- دەستپێکردن بە: ﴿ وَكَفَىٰ ﴾ لەئایەتی: ﴿ فَإِذَا دَفَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ أَمۡوَٰلَهُمۡ فَأَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبٗا ﴾ النساء: ٦.
- دەستپێکردن بە: ﴿ وَكَفَىٰ ﴾ لەئایەتی: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴾ النساء: ٥٠.
- دەستپێکردن بە: ﴿ وَكَانَ ﴾ لەئایەتی: ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورٗا ﴾ النساء: ٩٩.

- دەستپێکردن بە: ﴿ وَكَانَ ﴾ لەئایەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا بَعْضَكُمْ لِبَعْضٍ فِتْنَةً أَتَصْبِرُونَ ۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرًا ﴾ الفرقان: ٢٠.

- دەستپێکردن بە: ﴿ وَٱللَّهُ ﴾ لەئایەتی: ﴿ يَجْعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمْ فِىٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ حَذَرَ ٱلْمَوْتِ ۚ وَٱللَّهُ مُحِيطٌۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ البقرة: ١٩.

### ٣- دەستپێکردنی ڕێک (الابتداء الحسن):

ئەو دەستپێکردنەیە کە لەدوای وەستان لەجێگای تەواوو ئاسایی دەستپێبکرێتەوە، ئەو جۆرەیان چاك نیە کە لەدوای وەستان لەجێگای چاك یاخود نارێك دەستپێدەکرێتەوە، مەگەر لەسەرەتای ئایەتەوە نەبێت، لەو کاتەدا زۆربەی زانایانی قورئانخوێن دەستپێکردنەوەیان هەڵبژاردووە.

### وەستان و دەستپێکردن (الوقف والابتداء):

- وەستان لەسەر ئایەتی: ﴿ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴾ و دەستپێکردن بە: ﴿ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۗ ﴾ البقرة: ٢١٩ - ٢٢٠.

- وەستان لەسەر ئایەتی: ﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴾ و دەستپێکردن بە: ﴿ وَبِٱلَّيْلِ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴾ الصافات: ١٣٧ - ١٣٨.

## ٤- دەستپێکردن بۆ تاقیکردنەوە (الاختباري):

ئەو دەستپێکردنە بۆ فێرکردن بەکاردێت، وەك ئەم نموونانەی خوارەوە:

| وشە | شێوەی خوێندنەوە لەدەستپێکردن |
|---|---|

﴿ ٱؤْتُمِنَ ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیەدەخوێندرێتەوە: ﴿أُ وتُمِنَ﴾ البقرة: ٢٨٣.

﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿أَ للَّهُمَّ﴾ آل عمران: ٢٦.

﴿ إِنِ ٱمْرُؤٌا ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿إِ مْرُؤٌا﴾ النساء: ١٧٦.

﴿ ثُمَّ ٱقْضُوٓا ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿إِ قْضُوا﴾ يونس: ٧١.

﴿ فَقَالُوا ٱبْنُوا ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿إِ بْنُوا﴾ الكهف: ٢١.

﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿ لِيَقْطَعْ﴾ الحج: ١٥.

﴿ أَنِ ٱمْشُوا ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿إِ مْشُوا﴾ ص: ٦.

﴿ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿أَ لَئيْكَةِ﴾ ص: ١٣.

﴿ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱئْتُونِي ﴾ لەدەستپێکدا بەم شێوەیە دەخوێندرێتەوە: ﴿إِ يْتُونِي﴾ الأحقاف: ٤.



## سێیەم/ جۆرەکانی دەستپێکردنی ناڕێك و ناشایستە:

### ١- دەستپێکردنی ناڕێك و ناشایستە (الابتداء القبيح):

ئەو دەستپێکردنەیە کە ماناکە تێك ئەدات یان مانایەك دەبەخشێت کەویستی خوای گەورە (الله)ـی لەسەرنیە. وەك ئەم نموونانە:

- دەستپێکردن بەوشەی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ﴾ لەئایەتی:

﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ﴾ آل عمران: ١٨١.

- دەستپێکردن بەوشەی: ﴿يَدُ ٱللَّهِ﴾ لەئایەتی:

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ﴾ المائدة: ٦٤.

- دەستپێکردن بەوشەی: ﴿عُزَيْرٌ ٱبْنُ﴾ یان

دەستپێکردن بەوشەی: ﴿ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ﴾ لەئایەتی:

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ﴾ التوبة: ٣٠.

- دەستپێکردن بەوشەی: ﴿ٱللَّهُ﴾ لەئایەتی:

﴿وَإِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورًا﴾ الأحزاب: ١٢.

- دەستپێکردن بەوشەی: ﴿لَآ أَعْبُدُ﴾ لەئایەتی:

﴿وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾ يس: ٢٢.

## ٢- دەستپێکردنی زۆر لەخۆکردن، ناڕەوا (الابتداء التعسفي):

ئەو دەستپێکردنەیە کەهەندێ زمانەوان خورتی[1] تیادادەکەن یان قورئان خوێنەکان بەخۆماندوکردنێکەوە دەیکەن یان ئارەزووبازەکان ماناکەی لێك ئەدەنەوە بەدەستپێکردنێك کەنابێ بەئەنقەست دەستپێبکرێت، بەڵکو دەبێ بەتەواوەتی بەدوای ماناکەیدا بگەڕێت و تیایدا بوەستێت. وەك:

- وەستان لەسەر ﴿أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡ﴾ و دەستپێکردن بە ﴿هُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ﴾ البقرە: ٦.

- وەستان لەسەر ﴿لَا تُشۡرِكۡ﴾ و دەستپێکردن بە ﴿بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ﴾ لقمان: ١٣، ئەوە ناڕەوایە.



١) زۆر لەخۆکردن.

## تەوەرەی سێیەم




**یەكەم/ سكونی تەواو:**

بریتییە لەدارنینی سێ جۆرە جوولەكان ﴿(ـُ)، (ـً)، (ـٍ)﴾، ﴿ـُ ، ـَ ، ـِ﴾ لەكاتی وەستان لەسەر پیتی كۆتایی وشە بەمەبەستی پشوودان و وەرگرتنی هەوای هەناسە ئەمەش بنچینەیە لەكاتی وەستان، چونكە عەرەب بەجوولە ناوەستێت لەكۆتایی وشە.

**دووەم/ رەوم:**

بریتییە لەهێنان و دەربڕینی بەشێكی جوولە بەدەنگێكی نزم، بەمەرجێك جوولەكە (مرفوع، مضموم، مجرور، مكسور) بێت.

- نموونەی (مرفوع): ﴿نَسْتَعِينُ﴾ الفاتحة: ٥.
- نموونەی (مضموم): ﴿يَٰشُعَيْبُ﴾ هود: ٨٧.
- نموونەی (مجرور): ﴿الرَّحِيمِ﴾ الفاتحة : ٣.
- نموونەی (مكسور): ﴿هَٰٓؤُلَآءِ﴾ النساء: ١٤٣.

## هەندێ ڕوونکردنەوە دەربارەی ( ڕەوم ):

- بەشێوەیەك زۆربەی دەنگ تیایدا دەڕوات و نزم دەبێت.

- کەسی چاوساغ و نابینا لەنزیکەوە هەستی پێدەکات.

- لەسێ بەشی جووڵە (حرکة) دوو بەشی دەڕوات و بەشێکی دەمێنێ.

- لەناوەڕاست و کۆتایی وشە دێت، لەریوایەتی (حفص) نموونەی ناوەڕاست تەنها لەیەك شوێن هاتووە: ﴿تَأۡمَنَّا﴾ یوسف: ١١.

- ڕەوم حوکمی وەك حوکمی گەیاندن (وصل) وایە.

- ئەگەر پیتی پێش کۆتایی پیتەکانی (المد) بوون، ئەوە تەنها بەدوو جووڵە درێژدەکرێتەوە.

- فێرخواز لەرووی کرداری لەدەم و زاری مامۆستای شارەزاو لێزان فێردەبێت، واتە بەبێ بوونی مامۆستای شارەزا فێربوونی ئەستەمە.



**سێیەم/ ئیشمام:**

بریتیە لەخڕکردنی دوو لێوەکان لەدوای بە (ساکن) کردنی پیتی (مرفوع، مضموم) بەدەربڕینێکی بێدەنگ کەسی چاوساغ دەیبینێت و هەستی پێدەکات، بەڵام نابینا نایبینێت و هەستی پێناکات، نموونە:

﴿نَسۡتَعِينُ﴾ الفاتحة: ٥، ئەگەر بمانەوێ بوەستین بە (ئیشمام) پیتی (نون) دەکەین بە (سکون ) ئینجا دوولێوەکانمان خڕدەکەین.

## جۆرەکانی ئیشمام:

- لوولکردنی هەردوو لێوەکان لەدوای بە (ساکن) کردنی پیتی (مرفوع، مضموم) بەدەربڕینێکی بێدەنگ.
- شاردنەوەی جووڵە لەکاتی بە (ساکن) کردنی لەنێوان جووڵەوە، نموونە: ﴿تَأۡمَنَّا﴾ لەبنچینەدا دوو (نون)ـی جووڵەدارە بەم شێوەیە: ﴿لاَ تَأمَـنُـنَـا﴾.
- تێکەڵکردنی پیتێک بەپیتێکی تر وەك تێکەڵکردنی پیتی (زای) بە (صاد) لەخوێندنەوەی پێشەوا (حمزة) لەوشەی: ﴿ٱلصِّرَٰطَ﴾ الفاتحة : ٦.
- تێکەڵکردنی جووڵە بەجووڵەیەکی تر وەك تێکەڵکردنی (کسرة) بە (ضمة) لەخوێندنەوەی پێشەوا (الكسائي) و (هشام)، نموونە: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ﴾ البقرة : ١١.

## تێبینی دەربارەی ( ئیشمام ):

- بۆ فێرکردنی کەسی نابینا ئەوا مامۆستا لەڕێگای هەستی دەستەوە فێری دەکات.
- پێشەوەی لێوەکان لەکاتی ئیشمام خڕ (لوول) دەکرێ، وەك لەم وێنەیە دەردەکەوێت:



## سوودی ڕەوم و ئیشمام:

بریتیە لەئاشکراکردنی جوولەی بنەڕەتی پیتی کۆتایی، بەمەش جێگیردەبێت لەکاتی گەیاندنی پیتی وەستاو لەسەری بۆ ئەوەی کەسی گوێ بیست لەکاتی **ڕەوم** بۆی دەرکەوێت کەجوولەی پیتی کۆتایی چ جوولەیەك بووە، وە بۆ کەسی بینەریش لەکاتی **ئیشمام** دا دەرکەوێت کەجوولەی پیتی کۆتایی چ جوولەیەك بووە.



## بنچینەی ڕەوم:

ئەوپیتەی کەخوێنەر لەسەری دەوەستێ بە **ڕەوم** لەرووی قەڵەوو لاواز وەك باری گەیاندن مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ، نموونە:

﴿فَيَغْفِرُ﴾ ← لە کاتی گەیاندن ← پیتی (راء) قەڵەوە.

﴿فَيَغْفِرُ﴾ ← لە کاتی وەستان بە ڕەوم ← پیتی (راء) قەڵەوە.

﴿فَيَغْفِرْ﴾ ← لە کاتی وەستان بە سکون ← پیتی (راء) ناسك (لاوازە).

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ ← لە کاتی وەستان بە ڕەوم ← پیتی (راء) ناسك (لاوازە).

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ ← لە کاتی وەستان بە سکون ← پیتی (راء) قەڵەوە.

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ ← لە کاتی گەیاندن ← پیتی (راء) ناسك (لاوازە).

## بنچینەی ئیشمام:

ئەو پیتەی کەخوێنەر لەسەری دەوەستێ بە **ئیشمام** لەرووی قەڵەوو لاوازکردندا وەك باری وەستان کاری لەگەڵ دەکرێ، نموونە:

﴿فَيَغْفِرْ﴾ ← لە کاتی وەستان بە سکون ← پیتی (راء) ناسك (لاواز).

﴿فَيَغْفِرُ﴾ ← لە کاتی وەستان بە ئیشمام ← پیتی (راء) ناسك (لاواز).

﴿فَيَغْفِرُ﴾ ← لە کاتی گەیاندن ← پیتی (راء) قەڵەو.

## لەسێ حاڵەت ئیشمام و ڕەوم ڕوونادات:




(هـاء)ـی مێینـه بریتیـه لـەو (هـاء)ـەی کـه لکاوه بـەکۆتایی ناوەکان وەبەڵگەیە لەسەر مێینێتی، لەکاتی گەیاندن بە (تاء) دەخوێندرێتەوە، وە لەکاتی وەستان بە (هاء) خوێنەر دەوەستێ.

وەك: ﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ﴾ الأنعام: ١٥٧.

## چوارەم/ شیکردنەوەی جۆرەکانی وەستان لەکۆتایی وشە:

### جۆری یەکەم:

پیتـی کۆتـایی وشـەکە (سـاکن) بێـت بـه (سـکون)ێکـی بنـەڕەتی. وەك: ﴿ فَحَدِّثْ ﴾ الضـحى: ١١، ﴿ فَانصَبْ ﴾ الشـرح: ٧، حـوکمی وەسـتان و گەیانـدن یەکسانە بە (سکون)ێکی تەواو (محض).

### جۆری دووەم:

پیتی کۆتـایی وشـەکە جووڵاوبێـت بەیـەکێك لەسـێ جـۆرە (جووڵـەکان): بەمەرج دانراوە پیتی کۆتایی (هـاء)ـی ڕاناو (ضـمیر) و (هـاء)ـی مێینـه (تأنیث) و جووڵەی تووش هاتوو (عـارض) نەبێت لـەکاتی گەیانـدن، وە لەپێشیەوە پیتی درێژکراوو نەرم (اللین) نەبێت.

- ئەگەر پیتی کۆتایی جووڵاوبوو بە (فتحة)، ئەوە تەنها بە (سکون)ـی تەواو خوێنەر بۆی هەیە بوەستی لەسەری.

وەك: ﴿ هُنَالِكَ ﴾ آل عمران: ٣٨، ﴿ ٱلْكَوْثَرَ ﴾ الكوثر: ١.

- ئەگەر پیتی کۆتایی وشەکە جووڵاو بوو بە (ضمة) و تەنوین (ضمة)، ئەوە دروستە بۆ خوێنەر لەکاتی وەستان بەسێ شێوەو جۆر بخوێنێت.

وەك: ﴿ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ ﴾ التغابن: ١، ﴿ عَدُوٌّ ﴾ البقرة: ٣٦، ﴿ وَمِنۢ بَعْدُ ﴾ الروم: ٤.




- ئەگەر هاتوو پیتی کۆتایی وشەکە جولاو بوو بە (کسرة) و تەنوین (کسرة)، ئەوە دروستە بۆ خوێنەر لەکاتی وەستان بەدوو شێوەو جۆر بخوێنێت.

وەك: ﴿ وَٱلْعَصْرِ ﴾ العصر: ١، ﴿ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ القمر: ١٥.



## جۆری سێیەم:

**١-** ئەگەر هاتوو پێش پیتی کۆتایی پیتی درێژکردنەوەو نەرم (اللین) بووە، پیتی کۆتاییەکە جووڵاو بوو بە (فتحة)، لەم کاتەدا دروستە بۆ خوێنەر بەسێ شێوە بخوێنێت لەکاتی وەستان.

وەك: ﴿إِلَىٰ بَعۡضٍ ٱلۡقَوۡلَ﴾ سبأ: ٣١.




**٢-** ئەگەر پیتی کۆتایی (کسرة) بوو، ئەوە لەکاتی وەستان بۆ خوێنەر دروستە بەچوار شێوە بخوێنێت.

وەك:

﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ الحجر: ٣٥، ﴿إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ﴾ التوبة: ٥٢.




**تێبینی:** پیتی نەرم (اللین) لەکاتی وەستان بە ڕەوم درێژناکرێتەوە بەهیچ شێوەیەك، حوکمی وەك گەیاندن وایە، بەپێچەوانەی پیتی درێژکردنەوە (المد). وەك: ﴿نَوۡمٌ﴾ البقرة: ٢٥٥، ﴿قَوۡمٌ﴾ التوبة: ٦.

**٣- ئەگەر هاتوو پیتی کۆتایی (ضمة) بوو، ئەوە لەکاتی وەستان بۆ خوێنەر دروستە بەحەوت شێوە بخوێنێت.**

**وەك:**




## جۆری چوارەم:

**ئەگەر پیتی کۆتایی تەنوینی (فتحة) بوو، ئەوە دەگۆڕێ بۆ پیتی (الف) لەکاتی وەستان، وەکو ئەوەی باسمان کرد لە (مدّ العوَض).**

**وەك:** ﴿حَكِيمًا﴾ النساء: ١١،

﴿خَبِيرًا﴾ النساء: ٣٥،

﴿وَنِسَآءً﴾ النساء: ١،

﴿جُفَآءً﴾ الرعد: ١٧.

## جۆری پێنجەم:

ئەگەر پیتی کۆتایی (همزة)یەکی جووڵاو بوو، لەپێشی پیتی درێژکردنەوە هاتبوو، ئەم جۆرە درێژکردنەوەی بەیەکگەیشتووی پێ دەوترێت.

- ئەگەر (همزة)کە جووڵاو بوو بە (فتحة)، ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە (سكون)ی تەواو بوەستی بەسێ شێوە بخوێنێت، واتە: ڕەوم و ئیشمام نایگرێتەوە.

وەك: ﴿ ٱلدِّمَآءَ ﴾ البقرة : ٣٠.




- ئەگەر (همزة)کە جووڵەدار (متحرك) بوو بە (كسرة)، دروستە بۆ خوێنەر بەچوار شێوە بخوێنێت لەکاتی وەستان.

وەك: ﴿ ٱلدُّعَآءِ ﴾ آل عمران: ٣٨.

- ئەگەر (همزة)کە جووڵەدار (متحرك) بوو بە (ضمة)، دروستە بۆ خوێنەر بەهەشت شێوە بخوێنێت لەکاتی وەستان.

وەك: ﴿ يَشَآءُ ﴾ البقرة: ٢٨٤.

## جۆری شەشەم:

ئەگەر پیتی کۆتایی شەددە بوو لەپێشی پیتەکانی درێژکردنەوە هات، ئەمەیان پێی دەوترێت **درێژکردنەوەی پەیوەست** (اللازم).

- لەکاتی بە (فتحة) بوون خوێنەر تەنها بە (سکون)ێکی تەواو دەوەستی، وەك: ﴿صَوَآفَّ﴾.
- لەکاتی بە (کسرة) بوون بەدوو شێوە (وقف) دەکرێت لەسەری، وەك: ﴿ٱلدَّوَآبِّ﴾.
- لەکاتی بە (ضمة) بوون بەسێ شێوە (وقف) دەکرێت لەسەری، وەك: ﴿وَٱلدَّوَآبُّ﴾.

## جۆری حەوتەم:

ئەگەر پیتی کۆتایی وشەکە (هاء)ی (کناية) بوو، ئەوە رای زانایان لەڕێپێدان بە **ڕەوم** و **ئیشمام** سێ خال لەخۆدەگرێت:

١- هەندێك لەزانایان ڕێگەیان داوە، بەڵام پێویستی بەروونکردنەوە هەیە.

٢- هەندێك لەزانایان ڕێگەیان بە **ڕەوم** و **ئیشمام** نەداوە لەهەموو کاتەکان، چونکە (هاء)ی کنایە هاوشێوەی (هاء)ی مێینەیە، **ئیشمام** و **ڕەوم**یش ناچێتە سەر (هاء)ی مێینە لەکاتی وەستان.

٣- هەندێك لەزانایان ڕێگەیان بە **ڕەوم** و **ئیشمام** داوە بەهەموو جۆرەکانی.

## رای زانایان دەربارەی ( هاء )ــی راناو لە ڕەوم و ئیشمام




## روونکردنەوەی ( هاء )ــی راناو لەکاتی خوێندنەوەی بە ڕەوم و ئیشمام:

١- ئەگەر لەپێش پیتی (هاء)ـی راناو پیتی (واو) یان (ضمة) هاتبوو. وەك: ﴿قَتَلُوهُ﴾ النساء: ١٥٧، ﴿يَرْفَعُهُۥ﴾ فاطر: ١٠، ڕەوم و ئیشمام نابێت، چونکە دەربڕینەکە قورسە، خوێنەر تەنها بە (سکون) دەوەستێت لەسەر پیتی (هاء).

٢- ئەگەر لەپێش پیتی (هاء)ی راناو پیتی (ياء)ی ساکن یان (مکسور) هاتبوو، وە (هاء)ـەکەش خۆی (کسرة) بوو، ئەوە ڕەوم نابێت. وەك: ﴿بِوَٰلِدَيْهِ﴾ الأحقاف: ١٥، ﴿فَضْلِهِۦٓ﴾ فاطر: ٣٠، چونکە دەربڕینەکە قورسە، خوێنەر تەنها بە (سکون) دەوەستێت لەسەر پیتی (هاء)، بەڵام ئەگەر جووڵەی پیتی (هاء)ـەکە جیاواز بوو لەگەڵ جووڵەی پیتی پێش خۆی ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە ڕەوم و ئیشمام بخوێنێت، ئەمەش لەگێڕانەوەی (حفص) لەدوو جێگاو شوێن هاتووە.

وەك: ﴿أَنسَىٰنِيهُ﴾ الكهف: ٦٣، ﴿عَلَيْهُ ٱللَّهَ﴾ الفتح: ١٠.

٣- ئەگەر لەپێش پیتی (هاء) پیتی (ألف) یان (فتحة) یان (سکون)ێکی بنەڕەتی هاتبوو، ئەوە دروستە بۆ خوێنەر بە ڕەوم و ئیشمام بخوێنێت و پارێزگاری لەجوولەی (هاء)ەکە بکات لەکاتی دەرخستن، چونکە دەربڕینەکە قورس نیە.

وەك: ﴿ فَلْيَصُمْهُ ﴾ البقرة: ١٨٥، ﴿ عَلِمْتَهُۥ ﴾ المائدة: ١١٦، ﴿ ٱجْتَبَٰهُ ﴾ النحل: ١٢١.

**تێبینی لەسەر( هاء )ی گەیەندراو و جوولەی تووشهاتوو:**

١- پێویستە لەدەربڕینی پیتی (هاء)ی گەیەندراو (صلة) بە ڕەوم نەکرێت، چونکە حوکمی وەك وەستان لەسەری وایە،
بەڵام لە (هاء - کنایة) لەکاتی گەیاندن و وەستان هەر بە (ساکن) دەخوێندرێتەوەو ڕەوم و ئیشمامیش ناچێتە سەری.

وەك: ﴿ أَرْجِهْ ﴾ الأعراف: ١١١، ﴿ ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ﴾ النمل: ٢٨.

٢- ڕەوم و ئیشمام ناچێتە سەر پیتێك جووڵاوبێت بەجوولەیەکی تووشهاتوو.

وەك: ﴿ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ ﴾ آل عمران: ١٣٩، ﴿ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ ﴾ یونس: ٢.

# خشتەی شیکردنەوەی جۆرەکانی وەستان بەهەرسێ شێواز:

| ژ | جـــۆر | جووڵەی پیتی کۆتایی | نمـوونە | ژمارەی شێوەکان لەکاتی وەستان لەسەری |
|---|---|---|---|---|
| ١ | لەبنەڕەتدا سکونە | سکون | ﴿وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرۡغَب﴾<br>الشرح: ٨ | سکونی تەواو. |
| ٢ | بزواو<br>لەکاتی گەیاندن،<br>بەڵام لەپێشی پیتی<br>درێژکردنەوە و نەرم<br>(المد، اللين) نەبێت | فتحة | ﴿هُنَالِكَ﴾<br>آل عمران: ٢ | سکونی تەواو. |
| | | کسرة | ﴿لِرَبِّكِ﴾<br>آل عمران: ٤٣ | ١- سکونی تەواو،<br>٢- ڕەوم. |
| | | ضمة | ﴿وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ﴾<br>التغابن: ١ | ١- سکونی تەواو،<br>٢- ڕەوم،<br>٣- ئیشمام. |
| ٣ | درێژکردنەوەی<br>سکونی توشهاتوو<br>یان<br>درێژکردنەوەی نەرم<br>(المد العارض للسكون،<br>مد اللين). | فتحة | ﴿ٱلۡمَاعُونَ﴾<br>الماعون: ٧<br>﴿مَّنۡ أَسَرَّ ٱلۡقَوۡلَ﴾<br>الرعد: ١٠ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (قصر)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مام ناوەند (توسط)،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژ (طول). |
| | | کسرة | ﴿ٱلۡحِسَابِ﴾<br>النور: ٣٩<br>﴿ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِ﴾<br>التوبة: ٥٢ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (قصر)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مام ناوەند (توسط)،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژ (طول)،<br>٤- ڕەوم لەگەڵ کورت. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣ | درێژکردنەوەی<br>**سکونی توشهاتوو**<br>یان<br>**درێژکردنەوەی نەرم**<br>(المد العارض للسكون،<br>مد اللين). | **ضمة** | ﴿نَسۡتَعِينُ﴾<br>الفاتحة: ٥<br><br>﴿نَوۡمٌ﴾<br>البقرة: ٢٥٥ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (**قصر**)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مام ناوەند (**توسط**)،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژکردنەوە (**طول**)،<br>٤- **رەوم** لەگەڵ کورت (**قصر**)،<br>٥- **ئیشمام** لەگەڵ کورت (**قصر**)،<br>٦- **ئیشمام** لەگەڵ<br>مام ناوەند (**توسط**)،<br>٧- **ئیشمام** لەگەڵ<br>درێژکردنەوە (**طول**). |
| ٤ | سێ جۆرە<br>تەنوینەکە<br>لەکاتی وەستان<br>(ـٌ)، (ـً)، (ـٍ) | **فتحة** | ﴿رَقِيبًا﴾<br>النساء: ١ | گۆڕین بە (**الف**) |
| | | **كسرة** | ﴿تَكۡذِيبٍ﴾<br>البروج: ١٩ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (**قصر**)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مام ناوەند (**توسط**)،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژ (**طول**)،<br>٤- **رەوم** لەگەڵ کورت (**قصر**). |
| | | **ضمة** | ﴿عَظِيمٌ﴾<br>البقرة: ٧ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (**قصر**)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مام ناوەند (**توسط**)،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژ (**طول**)،<br>٤- **رەوم** لەگەڵ کورت (**قصر**)،<br>٥- **ئیشمام** لەگەڵ کورت (**قصر**)،<br>٦-**ئیشمام** لەگەڵ مامناوەند(**توسط**)،<br>٧-**ئیشمام** لەگەڵ درێژکردنەوە(**طول**). |

| | | | |
|---|---|---|---|
| درێژکردنەوەی<br>بەیەک گەیشتوو<br>(المَدُّ الواجِبُ المُتَّصِلُ) | فتحة | ﴿ٱلدِّمَآءَ﴾<br>البقرة: ٣٠ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مام ناوەند (توسط)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ پێنج جووڵە،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژ (طول). |
| | کسرة | ﴿ٱلدُّعَآءِ﴾<br>آل عمران: ٣٨ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مام ناوەند (توسط)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ پێنج جووڵە،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژ (طول)،<br>٤- رەوم لەگەڵ<br>مامناوەند (توسط)،<br>٥- رەوم لەگەڵ<br>درێژکردنەوە پێنج جووڵە. |
| | ضمة | ﴿يَشَآءُ﴾<br>البقرة: ٢٨٤ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مامناوەند (توسط)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ پێنج جووڵە،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ درێژ (طول)،<br>٤- رەوم لەگەڵ مامناوەند (توسط)،<br>٥- رەوم لەگەڵ<br>درێژکردنەوە پێنج جووڵە،<br>٦- ئیشمام لەگەڵ<br>مامناوەند (توسط)،<br>٧- ئیشمام لەگەڵ<br>درێژکردنەوە پێنج جووڵە،<br>٨- ئیشمام لەگەڵ درێژ (طول). |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٦ | دریژکردنەوەی پەیوەست<br>(المـدُّ اللازِم المُـخَفَّفُ الْكَلِمِيُّ) | فتحة | ﴿صَوَآفَّ﴾<br>الحج: ٣٦ | سکون لەگەڵ دریژ (طول). |
| | | كسرة | ﴿ٱلدَّوَآبِّ﴾<br>الأنفال: ٢٢ | ١- سکون لەگەڵ دریژ (طول)،<br>٢- رەوم لەگەڵ دریژ (طول). |
| | | ضمة | ﴿وَٱلدَّوَآبُّ﴾<br>الحج: ١٨ | ١- سکون لەگەڵ دریژ (طول)،<br>٢- رەوم لەگەڵ دریژ (طول)،<br>٣- ئیشمام لەگەڵ دریژ (طول). |
| ٧ | (هاء)ی رانـــاو<br>(هاء الكناية) | | ﴿يَرۡفَعُهُۥ﴾<br>فاطر: ١٠ | سکونی تەواو. |
| | | | ﴿فَضۡلِهِۦ﴾<br>فاطر: ٣٠ | سکونی تەواو. |
| | | | ﴿قَتَلُوهُ﴾<br>النساء: ١٥٧<br>﴿فَلَمَّا رَأَوۡهُ﴾<br>الملك: ٢٧ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (قصر)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مامناوەند (التوسط)،<br>٣- سکونی تەواو<br>لەگەڵ دریژ (طول). |
| | | | ﴿فَأَلۡقِيهِ﴾<br>القصص: ٧<br>﴿بِوَٰلِدَيۡهِ﴾<br>الأحقاف: ١٥ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (قصر)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مامناوەند (التوسط)،<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ دریژ (طول). |
| | | | ﴿فَلۡيَصُمۡهُۖ﴾<br>البقرة: ١٨٥<br>﴿مِّنۡهُۚ﴾ النساء: ١٥٧ | ١- سکونی تەواو،<br>٢- رەوم،<br>٣- ئیشمام. |
| | | | ﴿عَلِمۡتَهُۥۚ﴾<br>المائدة: ١١٦<br>﴿دَلۡوَهُۥ﴾<br>یوسف: ١٩ | ١- سکونی تەواو.<br>٢- رەوم.<br>٣- ئیشمام. |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧ | (هاء)ی ڕانـــاو<br>(هاء الكناية) | | ﴿ٱجۡتَبَىٰهُ﴾<br>النحل: ١٢١ | ١- سکونی تەواو<br>لەگەڵ کورت (قصر)،<br>٢- سکونی تەواو<br>لەگەڵ مامناوەند (التوسط)،<br>٣- سکونی تەواو لەگەڵ درێژ،<br>٤- ڕەوم لەگەڵ کورت (قصر)،<br>٥- ئیشمام لەگەڵ کورت (قصر)،<br>٦-ئیشمام لەگەڵ<br>مامناوەند (التوسط)،<br>٧- ئیشمام لەگەڵ درێژ (طول). |
| ٨ | (هاء)ی مێینە<br>(التأنيث) | فتحة | ﴿غِلۡظَةً﴾<br>التوبة: ١٢٣<br>﴿مَرَّةٍ﴾<br>التوبة: ١٣<br>﴿إِخۡوَةٌ﴾<br>الحجرات: ١٠ | گۆڕین<br>(وەستان بە (هاء)ی ساکن). |
| | | | ﴿نِعۡمَتَ﴾<br>إبراهيم: ٣٤ | سکونی تەواو. |
| | | كسرة | ﴿وَمَعۡصِيَتِ﴾<br>المجادلة: ٨ | ١- سکونی تەواو،<br>٢- ڕەوم. |
| | | ضمة | ﴿وَرَحۡمَتُ﴾<br>الزخرف: ٣٢ | ١- سکونی تەواو،<br>٢- ڕەوم،<br>٣- ئیشمام. |
| ٩ | توشهاتووی<br>شێوە (شکل) | سێ<br>جووڵە | ﴿وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ﴾<br>آل عمران: ١٣٩<br>﴿أَنۡ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ﴾<br>يونس: ٢ | سکونی تەواو<br>بەبێ ڕەوم و ئیشمام. |

## خوێندنەوەی سورەتی ( الفاتحە )

## بۆ هەڵهێنجانی حوکمەکانی وەستان بە ( سکونی تەواو ( محض )، ڕەوم، ئیشمام ):

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ وەستان تەواو (تام)ـە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ وەستان تەواو (تام)ـە.

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ وەستان ڕێك (حسن)ـە.




ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ وەستان ڕێك (حسن)ـە.




مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ وەستان تەواو (تام)ـە.

إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴿٥﴾ وەستان تەواو (تام)ـە.




ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿٦﴾ وەستان لەجێ (كافي)ـە.

صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ وەستان ڕێك (حسن)ـە، بەڵام چاك وایە بگەیندرێت.

غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ وەستان تەواو (تام)ـە.

**تێبینی:** شێوەو وێنەی لێوەکان لەکاتی (ئیشمام):



# ناوەڕۆك

## بەشی دووەم

## ليستى سەرچاوەكان:


١- مصحف المدينة.

٢- أحكام قراءة القران الكريم: الشيخ محمود خليل الحصري، دار (البشـائر الاسـلامية)، ط (٨)، ١٤٢٧هـ ـ ٢٠٠٦م.

٣- الاصول النيرات في القراءات: أ. أماني بنت محمد عاشور، ط (٢)، ١٤٣٠هـ ـ ٢٠٠٩م.

٤- بغية المريد من أحكام التجويد: الدكتور المهدى محمد يوسـف الحـرازي، دار (البشـائر الاسلامية)، ط (٢)، ١٤٢٧هـ ـ ٢٠٠٦م.

٥- التبيين في أحكام تلاوة الكتاب المبين: الشيخ عبـداللطيف فـايز دريـان، دار (المعرفـة)، ط (١)، ١٤٢٠هـ ـ ١٩٩٩م.

٦- التجويـد المصـور: د. أيمـن رشـدي سـويد، مكتبـة (إبـن الجـزري)، ط (١)، ١٤٣٢هـ ـ ٢٠١١م.

٧- تە فسيرى ئاسان: برهان محمد أمين، بلاوكراوەكانى كتيبخانەى (روشنبير).

٨- تيسـير الـرحمن في تجويـد القـرآن: د. سـعاد عبدالحميـد، دار (التقـوى)، ط (١)، ١٤٣٠هـ ـ ٢٠٠٩م.

٩- تيسير علم التجويد: الشيخ أحمد بن احمد محمـد عبـدالله، دار (إبـن خزيمـة)، ط (٢)، ١٤٢٣هـ ـ ٢٠٠٢م.

١٠- جداول أحكام التلاوة والتجويد: مديحة صالح مهدي، دار (طيبـة الخضـرا)، ط (٢)، ١٤٣٣هـ ـ ٢٠١٢م.

١١- حلية التلاوة في تجويد القرآن: د. رحاب محمد مفيد شققي، مكتبـة (روائـع المملكـة)، ط (٤)، ١٤٣١هـ ـ ٢٠١٠م.

١٢- الدُرَرُ البهية في التعريفات التجويدية: هشام عبدالباري محمـد راجـح، دار (العالميـة)، ط (١)، ١٤٣١هـ ـ ٢٠١٠م.

١٣- شرح السلسبيل الشافي في تجويد القران: عثمان بن سليمان مراد، مكتبـة (اولاد الشـيخ للتراث)، ط (١)، ١٤٢٩هـ ـ ٢٠٠٨م.

١٤- علم التجويد (المستوى الثاني): د. يحيى عبدالرزاق الغوثاني. دار الغوثاني للدراسات القرآنية، ط (٤)، ١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م.

١٥- فوائد وتصويبات للمجازين والمجازات: محمد احمد البدور محمد ناقد صطوف، ط (٣)، ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩.

١٦- المبتكر المفيد في علم لتجويد: حياة بنت خليل بن محمد بن حسين، دار (الغوثاني للدراسات القرآنية)، ط (٣)، ١٤٣٨هـ - ٢٠١٧م.

١٧- المختصر الوافي من هداية القاري الى تجويد كلام الباري: الشيخ عبدالفتاح المرصفي، دار (الغوثاني للدراسات القرآنية)، ط (١)، ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م.

١٨- المُذكرة في التجويد: د. محمد نبهان بن حسين مصري، دار (محوى٢)، ط (٥٤)، ١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م.

١٩- معالم الاهتداء إلى معرفة الوقوف والإبتداء: الشيخ محمود خليل الحصري، دار (الغوثاني للدراسات القرآنية)، ط (١)، ١٤٣٢هـ - ٢٠١١م.

٢٠- المنارفي رواية حفص من طريق طيبة النشر: د. عمر يوسف حماد، ط (٢)، ١٤٣٢هـ - ٢٠١١م.

٢١- المنير في أحكام التجويد: جمعية المحافظة على القران الكريم، ط (١٨)، ١٤٣١هـ - ٢٠١٠م، ط (٢٢)، ١٤٣٤هـ - ٢٠١٣م.

٢٢- الواضح في أحكام التجويد: الدكتور محمد عصام مفلح القضاة، دار (النفائس)، ط (٤)، ١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣م.

